# ئافرەتی مسوڵمانی کورد

## مافە شەرعییەکانی و ئەرکە گرنگەکانی



عەلی باپیر

چاپی دووەم

١٤٢٤ك ٢٠٠٣ز

# ئافرەتی مسوڵمانی کورد

## مافە شەرعییەکانی و ئەرکە گرنگەکانی



عەلی باپیر

چاپی یەکەم

١٤٢٣ك

٢٠٠٣ز

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

(وَلَهُنَّ مِثْلُ الَّذِي عَلَيْهِنَّ بِالْمَعْرُوف)

(البقرة)

پێشکەش بێ:-

بەو ئافرەتانەی کەهەم مافە شەرعییەکانیان داوا دەکەنو هەم ئەرکە شەرعییەکانیشیان جێ بەجێ دەکەنو، لەمەیدانی خواپەرستیی و دینداریشدا لەگەڵ پیاوان پێشبڕکە دەکەن.

# ئەم نامیلکەیە

## خوێنەری بەڕێز:

ئەم نامیلکەیە -وەك زۆر نامیلکەی دیکەی بەندە- لەئەسڵ دا وتارێك بووە لەکۆڕێك[1] دا دراوە کە لەمزگەوتی (جیهاد)دا بۆ ژمارەیەکی زۆر لەخوشکان لەڕۆژی (١٢ی ڕەجەبی ١٤٢٣) بەرانبەر بە (٢٠٠٢/٩/١٩)دا بەسترا بوو.

پاشان خوشکی بەڕێزمان خوشکە (شەمسە سەعید) کەهەر خۆیشی سەرپەرشتیاری کۆڕەکەی بەئەستۆوە گرتبوو لەکاسێتەوە هێناویەتە سەر کاغەزو پاشان دوای چاوپێداخشاندنەوەی خۆم و وردە دەستکارییەکی چەند وشەو ڕستەیەکی، دووبارە برای بەڕێزم کاك: (وشیار سەنگاوی)ی بەخەتێکی خۆش نووسیویەتەوەو ئامادەی چاپ کراوە.

خواش بەکەرەمی خۆی پاداشتی بەرزی هەرکام لە (شەمسەخان)و کاك (وشیار) بداتەوەو ئەم بەرهەمەش بکاتە مایەی بەهرە وەرگرتنی خوێنەران بەگشتیو خوشکە بەڕێزەکانمان بەتایبەت.

شایانی باسیشە کەئێمە خوا پشتیوان بێ لەکتێبی: (ئافرەتو خێزان لەسایەی شەریعەت دا) دا هەموو ئەو باسو بابەتانەی کەلەبارەی ئافرەتو خێزانەوە بۆ ئەم ڕۆژگارە بەپێویستیان بزانین، دەیانتوێژینەوە، کەسوپاس بۆ خوا تائێستا زیاتر لە چل (٤٠) ئاڵقەی لەڕۆژنامەی (کۆمەڵ)دا لێ بڵاوکراوەتەوە، بەڵام ئەم نامیلکەیەش کورتەو پوختەیەکی باشی لەبارەی مافو ئەرکەکانی ئافرەتی موسوڵمانی کوردەوە گرتۆتە خۆی، بۆیە بەچاکمان زانی کەوەك پێشەکیو نۆبەرەیەکی ئەو کتێبە، جارێ ئەم نامیلکەیە بڵاو بکەینەوە.

چونکە بەڕاستی بەهەموو قەناعەتەوە دەڵێم کەئافرەتانی موسوڵمان لەکوردستانو سەرجەم وڵاتانی دیکەی ئیسلامیش دا دووچار دووچاری

---

[1] دیارە کۆڕەکە پرسیارو وەڵامی زۆریشی گرتبوونە خۆ بەڵام بەپێویست نەزانرا بنووسرێنەوە.

ستەمدیدەیی (مظلومیة) و بەشخوراویی (بخس الحق) بوونە: جارێکیان: بەهۆی کەمتەرخەمیی پیاوانەوە لەبەرانبەر دابینکردنی هەق و مافە شەرعییەکانیان دا، کەڕەنگە زۆرجاریش ئەو کەمتەرخەمییە بەهۆی بێئاگایی لەشەریعەتەوەو پەروەردە بوونێکی هەڵەوە، بەهەڵوێستێکی ڕەواو شەرعیش دابنرێ و لەسەر ئیسلام و شەریعەتیش حیساب بکرێ!!

دووەمیان: لەلایەن ئەو تەوژمە عەلمانیی و غەرب زەدەیەوە گەدەیەوێ ئافرەتی مسوڵمانی کورد لەدین و ڕەوشت و قیەم و ڕەسەنایەتی مسوڵمانەتی و کوردایەتی خۆی دووربخاتەوەو، بەزۆری زۆرداری بەمەرەدی ئافرەتی داماوو بێدەرەتانی ڕۆژئاوای بەرێ، کەهەرکەسێك خاوەنی هەست و نەستێکی مسوڵمانانەو ویژدانێکی ساغ و زیندوو بێت بەزەیی و پەرۆشی دەجوولێ و گریانی دێت بۆ حاڵ و باڵی تفت و تاڵی ئافرەتی ڕۆژئاوایی، خێزان لێهەڵوەشاوو سروشت تێکدراو سەرگەردان!

بەڵام خوا پشتیوان بێ هۆشیاریی و بێداریی مسوڵمانان بەگشتی و خوشکانمان بەتایبەت، دەبێتە مایەی دەربازبوونیان لەهەردووك چۆرتم و گرفتەکەو سەرەنجام ئافرەتی مسوڵمانی کوردستان، هەم هەقە شەرعییەکانی دەست دەخات و، هەم ئەرکەکانیشی جێبەجێ دەکات، وەلەئاکام دا کارێك دەکات کەپارێزگاریی لەڕەسەنایەتی ئیسلامیی و نەتەوەیی خۆی بکات و لەسەرووی هەموو شتێکیشەوە خوای پەروەردگار لەخۆی ڕازی بکات و خۆی لەئاگریی دۆزەخ پارێزراوو سەلامەت و بەهەشتیش بۆ خۆی مسۆگەرو حەڵاڵ بکات.

٢٦ی رمضان ١٤٢٣

٢٠٠٢/١٢/١ ئەحمەداوا

# پێشەکی

الحمدلله والصلاة والسلام على رسول الله محمد وآله وصحبه ومن اهتدى بهداه

سەرەتا بەخێرهاتنی هەموو خوشکە بەڕێزەکان دەکەم بەخێر بێن یاخوا خۆشحاڵین بەدیداری هەموو لایەك.

خوای پەروەردگار ئەم کۆڕو مەجلیسەمان لەو کۆڕو مەجلیسانە بگێڕێ کەدەبنە مایەی دابارینی ڕەحمەتو بەزەیی خوای بەبەزەیی وەدەبن بەمایەی سوودو بەهرە وەرگرتنی هەموو لایەك.

خوشکە بەڕێزەکانم:- ناونیشانی وتارەکەمان بەم شێوەیەیە (ئافرەتی مسوڵمانی کورد؛ مافە شەرعییەکانی و ئەرکە گرنگەکانی) وەك ئەو خوشکە[٢] بەڕێزەمان، ئاماژەی پێکرد لەڕۆژگاری ئەمڕۆماندا و لەئەنجامی کۆمەڵێك هۆکاردا: (هۆکاری فیکری، سیاسی، ئابووری، کۆمەڵایەتی، وەبەرەو پێش چوونی ژیان لەڕووی ماددی و تەکنەلۆژیاوە)، مەسەلەی ئافرەت و خێزان کەوتۆتە نێو کەش و هەوایەکەوە کەئینسان تێیدا بەرەو چارەنووسێکی پڕ مەترسی دەچێ، کەبریتی یە لەپەرەپێدانی لایەنی ماددی وەبریتی یە لەتەرکیزکردن و جەخت کردنەوە لەسەر لایەنی جەستەیی و غەریزەیی ئینسان، وەفەرامۆش کردنی لایەنی ڕۆحی و ئەخلاقی و قیەمی، بەواتایەکی دیکە: ئەوەی کەشارستانیەتی یان بەناو شارستانێتی ئەمڕۆی ماددی ئەورووپاو ڕۆژئاوا لەئینسانی دەوێت، ئەوەیە کەهەر خەریکی دونیا بێت وەبێ خەبەر بێت لەخوا (تبارك وتعالى) وە هەموو هەوڵی خۆی چڕبکاتەوە لەوەدا کەچۆن غەریزەکانی تێر بکات، وەچۆن لەڕووی ماددی یەوە خۆی بەختەوەرو خۆی ئیشباع بکات، بەبێ ئەوەی گوێ بەدین و بەئەخلاق و قیەم و بەدوارۆژ بدات!! بەڵێ جا لەکەش و هەوایەکی ئاوادا ئافرەتی مسوڵمانی کورد دەبێ زۆرچاك وردبێتەوە و بزانێت ئەو ئایینەی کە ئینتیمای بۆ لای هەیە (چونکە ئێمە وتارەکەمان تایبەتە بەئافرەتی مسوڵمان و بەخوشکانی مسوڵمانەوە).

---

[٢] خوشکە (شەمسە سەعید) کەسەرپەرشتیاری کۆڕەکەی کرد.

بەڵێ هەر ئافرەتێکی مسوڵمان دەبێت جوان سەرنج بدات داخۆ ئەو دینەی کە ئینتیمای بۆی هەیە کەئیسلامە بزانێت چ مافێکی پێداوە، چ هەقێکی بۆ دیاری کردوە، وەپاشانیش چ ئەرکێکی خستۆتە سەرشانی و چ ئیشێکیشی بۆ دیاری کردوە؟! بۆئەوەی هەم مافەکانی داوا بکات و هەم ئەرکەکانی سەرشانیشی جێبەجێ بکات، جائەگەر تەماشای هۆیەکانی ڕاگەیاندنی ئەم سەردەمو ڕۆژگارەمان بکەین لەکۆمەڵگای کوردەواری خۆماندا، بەداخەوە کەهەرچەندە میللەتەکەمان میللەتێکی مسوڵمانە، وەهەرچی ڕاست دەبێتەوە خۆیشی بەمسوڵمان دەزانێ[٣] بەڵام ئەگەر گوێ هەڵخەین بۆ هۆیەکانی ڕاگەیاندن وە سەرنج بدەین بۆمان دەردەکەوێ کەئەوەی حیسابی بۆ ناکرێت بەتایبەت لەچوارچێوەو لەبواری خێزان و ئافرەت و پەروەردەی گشتیدا لەنێو ئەم میللەتە مسوڵمانەی ئێمەدا بریتیە لەمسوڵمانەتی و دینداری، وەبریتیە لەو ئەدەب و قیەمو ئەخلاقەی کەدین و مسوڵمانەتی فەرمانی پێدەکات! بۆیە ئەگەر بەهەموو لایەکمانەوە وەك خەڵکێکی مسوڵمان کەدەمانەوێت بەمسوڵمانەتی بژێین چ پیاوان چ ئافرەتان، چ برایان چ خوشکان، ئەگەر خۆمان زۆر وریا نەبین بەڕاستی ئەوەی کە دەویسترێت لەکوردستاندا وە لەغەیری کوردستاندا پیادە بکرێت، بریتییە لەپەلکێش کردنی کۆمەڵگا بەرەو نەفامێتی: نەفامێتی عەقیدەو ئەخلاق و، نەفامێتی سیستەمو حوکم و، بەکورتی لەهەموو لایەنەکانی ژیاندا کۆمەڵگایەکەمان بەرەو نەفامێتی دەبردرێ! کوردەواری خۆشمان گوتوویانە (سەرچۆپی بدە دەست گامێشێ بۆلای کادێنێ دەیکێشێ) کەسێك خۆی دینی نەبێت موستەحیلە دینداریی فێری خەڵك بکات، وەکەسێك بڕوای بەو قیەمو ئەدەب و ئەخلاقە نەبێ کەلەدینەوە سەرچاوە دەگرێت، موستەحیلە مادام خۆی نیەتی خەڵکی لێ بەهرەمەند بکات!! جا من بەپێویستم زانی کەئەم وتارەم لەم دوو تەوەرەیەدا پێشکەش بکەم.

---

[٣] لەڕۆژی (٢٤ رمضان ١٤٢٣) بەرانبەر بە (٢٠٠٢/١١/٢٩)دا وتارێکم لەمزگەوتی (جیهاد) لەسلێمانیدا بەناوونیشانی: (ئینسانی مسوڵمان کێیە؟!)، خوا یاربێ بەشێوەی نامیلکەش بڵاوی دەکەینەوە.

یەکەم: مافە شەرعیەکانی ئافرەتی مسوڵمان چین؟

دووەم: ئەرکەکانی سەرشانی ئافرەتی مسوڵمان چین؟

# تەوەرەی یەکەم

# مافە شەرعییەکانی ئافرەتی مسوڵمان چین؟!

لەپێشدا باسی مافە شەرعییەکانی ئافرەت دەکەین چونکە هەرکەسێك مافی پێنەدرێت و مافی پێنەدەیت و مافەکانی بۆ دابین نەکەیت، ناتوانیت واجبێك و ئەرکێکی لێ داوا بکەیت! هەرکەسە بەئەندازەی ئەوە دەتوانێت ئەرکی سەرشانی جێبەجێ بکات کەزەمینەی بۆ ساز دەکرێت و مافەکانی بۆ دابین دەکرێن، وەپێش ئەوەی بچمە سەر تەوەرەی یەکەمی وتارەکەم دەمەوێت ئەوە بیری خوشکانی بەڕێزمان بێنمەوە کەئێمە ماوەیەك لەمەوبەر دوو کۆڕمان بەستن دەربارەی (تیرۆر) وەدەربارەی (سیکۆلاریزم) دیارە هەندێك ڕەخنەو تێبینیمان پێگەیشتەوە کەبۆچی خوشکانی بەڕێزیش تێیاندا بەشدار نەکراون؟! جائێمە لەهەردوو کۆڕەکەدا ڕوونمان کردەوە کەهۆیەکەی دەگەڕێتەوە بۆ بەر تەسکی ئەو شوێنەی کەکۆڕەکانی تێدا بەستران و قەرەباڵغیەکی زۆری لێبوو، وەپێمان وابوو کەئەگەر خوشکانی بەڕێز بێن تووشی سەغڵەتی دەبن و تووشی ناڕەحەتی دەبن و گوتمان باخوشکانمان لەو قەرەباڵغیەدا تووشی ناڕەحەتی و حاڵەتێکی سەغڵەتی و ئیحراج نەبن، دوایش دیارە کۆڕەکان لە (تەلەفزیۆن) لێدران و خوا یاربێ خوشکان توانیویانە بەشداری نەبوونیان قەرەبوو بکەنەوە، جا لەسۆنگەی ئەوەوە کەئەو کۆڕانەی بەستران، تێدا بەشداربوونیان تایبەت بوو بەبرایانەوە، گوتمان با کۆڕێکی تایبەتیش بۆ خوشکان ببەستین ئەوە لەلایەك وەلەلایەکی دیکەشەوە بەتەئکید ئافرەتان کۆمەڵێك بابەت و مەسەلەی تایبەت بەخۆیان هەیە کە ناگونجێت

لەشوێنی گشتیدا باس بکرێت، هەندێك شتی تایبەت بەخۆیان هەیە واباشە لەکۆڕو لەشوێنی تایبەت بەخۆیاندا باسبکرێن، هەربۆیەش پێغەمبەرﷺ دوای ئەوەی کەئافرەتان داوایان لێکرد کەڕۆژێکیان بۆ دیاری بکات لەهەفتەدا پێغەمبەر ﷺ ڕۆژێکی بۆ دیاری کردن ئافرەتان دەچوون بۆ خزمەتیو ئەوەی کەخۆیان بەلایانەوە گرنگ و مەبەست بوو عەرزی پێغەمبەریانﷺ دەکرد ئەویش بۆی ڕوون دەکردنەوە.

ئێستاش بابچینە سەر بڕگەکانی تەوەرەی یەکەمی باسەکەمان: (مافە شەرعییەکانی ئافرەتی مسوڵمان) :-

خوشکانی بەڕێزم: بێگومان ئافرەتی مسوڵمان وەك پیاوی مسوڵمان هەردووکیان ئینسانن هەردوکیانیش بەندەی خوان، جا هەموو زانایانی ئیسلام لەسەر ئەوە یەك دەنگن کەئافرەتیش وەك پیاوە، واتە وەك پیاو بەبێ هیچ جیاوازییەك لەڕوانگەی شەریعەتی خوای پەروەردگارەوە ئینسانەو وەك پیاو بەندەی خوایەو وەك پیاویش لەبەرانبەر شەریعەتو بەرنامەی خوای پەروەردگاردا بەرپرسیارە، دیارە ئەوە بۆ ئێمەی مسوڵمانو ئیسلامی بەڵگەنەویستە بەتایبەتی لەم سەدەی بیستو یەکەدا کەدونیا زۆر بەرەو پێش چووە، بەڵام ئەوەی کەئێستا بووەتە شتێکی ئاشکراو ڕوون وە بووەتە شتێکی بەڵگەنەویست، کاتی خۆی مشتومڕی زۆری لەسەر بووە بەتایبەت لەنێو فەیلەسووفەکانی یۆنانو ئیغریقیەکانو هیندۆسیەکاندا، مشتومڕی زۆری لەسەر بووە کەئایا ئافرەتیش وەك پیاو ئینسانە وە نەفسێکی ئینسانی هەیە یان لەخوار پیاوەوەیە؟! وەدینی شێوێندراوی نەصرانییەتیش کێشەو مشتومڕی زۆری لەبارەیەوە کردوە!! لەحاڵێکدا کە قوئان هەر زوو لەبەرئەوەی کە لە زانیاری بێسنووری خواوە سەرچاوەی گرتووە لەگەڵ ئەوەشدا کەپێچەوانەی عورفو باوو نەریتی کۆمەڵگای نەفامیی ئەوسا بوۆە، بەڵام خوای گەورە هەر لەیەکەم ڕۆژەوە وەك ڕاستییەکی ڕوونو بێچەندو چوون

ڕایگەیاندوە کەئافرەتو پیاو هەردووکیان بەندەی خودان، بەڵام ڕێچکەکان دوای هەوڵی زۆرو دوای تەقەلاو کۆششی زۆر، وە ئافرەتان دوای ڕەنجو زەحمەتو قوربانی دانی زۆر گەیشتنە ئەوەی کە تاڕاددەیەك وەك پیاو تەماشا بکرێن! هەرچەندە ئێستاش لەکۆمەڵگاکانی ڕۆژئاوادا لەزۆر بواراندا ئافرەت وەك پیاو هەر تەماشا ناکرێت، بۆ وێنە لەمەسەلەی کرێدا، لەکرێی ئیش کردندا وەك پیاو تەماشا ناکرێ، وە لەمەسەلەی سەربەخۆبوونی خۆدا ئێستاش ئافرەتانی ئەوروپایی بەناوی مێردەکانیانەوە ناودەبرێن، ئافرەتی ئەوروپایی هەتا خێزانی سەرۆك کۆمارەکانیشیان بەناوی مێردەکانیانەوە ناودەبرێن نەك بەناوی باوکیان، واتە ئافرەت لەڕۆژئاوا ئێستاش لەگەڵ بێ خاوەنی کەسایەتی شەخصیەتی سەربەخۆی خۆی نییە!! بەڵام لەقورئانێدا ئەو مەسەلەیە هەر زوو بڕاوەتەوە هەرچەندە بەداخەوە زۆر لەخەڵکی (غەرب زەدە) [٤]ی خۆمان واتە ئەوانەی لەژێر کاریگەریی فەرهەنگی ڕۆژئاواو سیاسەتی ئەوروپاو ڕۆژئاوادان ئەو حەقیقەتە نازانن و لەسۆنگەی ئەوە کەتەماشا دەکەن و دەبینن مسوڵمانان دواکەوتوون لەڕووی شارستانێتیو (تەکنۆلۆژیا)وە، وە لەبەرئەوەی کەدەبینن مسوڵمانان ژێر دەستەن لەڕووی سیاسییەوە، وا دەزانن کەئەوە خەتای دینەکەیانە وەپێشیان وایە کەئافرەتانی مسوڵمان بەهۆی دینەکەیانەوە تووشی بەجێماوی بوون، وەپێیان وایە کەئافرەتانی ئەوروپا بەهۆی بێدینییەوە پێش ئافرەتانی مسوڵمان کەوتوونەتەوە!! بەڵام لەحەقیقەتدا وا نیەو ئەوە چەواشەکارییەو بەهیچ جۆرێك ئیسلامو دینداریی ڕاستەقینە ئافرەتانی مسوڵمانی وەپاش نەخستووە، چونکە زانایانی ئیسلام هەموویان چ توێژەرەوانی قورئان چ فەرمووده ناسەکان چ شەرعزانو ئوصولییەکان هەموویان لەسەر ئەوە یەك

---

[٤] (غەرب زدە) وشەیەکی فارسییە واتە: کارتێکراو لەلایەن بیردۆزەو ڕێچکە ڕۆژئاواییکانەوە.

دەنگن‌و دەڵێن: هەرچی دواندنەکان (خطابات)ی قورئان هەیە واتە ئەوە کەخوای پەروەردگار بانگی ئیماندارانی کردوەو بانگی مسوڵمانانی کردوە کەوا بکەن وا مەکەن‌و ئەوە حەڵاڵە ئەوە حەرامە:

ئەوە هەمووی نێرو مێی تێدا یەکسانن بەبێ جیاوازی، سەرجەم زانایانی ئیسلام لەسەر ئەوە یەك دەنگن، بەڵام دوایی ئێمە کەدەبینین عورفی هەڵەی مسوڵمانان لەکۆمەڵگای کوردەواری یان لەکۆمەڵگایەکی دیکەدا وای کردوە کەئافرەت بەپلە دوو یان بەپلە سێ حیساب بکرێ، ئەوە عورفی هەڵەی مسوڵمانان وای کردوەو بەجێ‌ماوێتیی‌و دواکەوتوێتی مسوڵمانان لەدینەکەیان وای کردوە، ئەگەرنا لەئیسلام دا شتی وا نییە، با تەماشای ئەو ئایەتانە بکەین، جارێ وەك گوتم هەموو کتێبەکانی (أصول الفقه) و شەرعزانان هەروەها سەرجەم (مفسرون و محدثون) دەڵێن، لەهەر شوێنێکدا خوای پەروەردگار بەگشتی بانگی خەڵکی کردبێت بۆ وێنە: فەرموویێتی: (یا أیها الناس) واتە: ئەی خەڵکینە! ئەوە لەگەڵ پیاوان‌و ئافرەتانیەتی بەبێ جیاوازی، هەروەها (یا بني آدم) واتە: ئەی وەچەی ئادەم! دیسان لەگەڵ هەردووکیانیەتی، وە (یا أیها الانسان) واتە: ئەی مرۆڤ! لەگەڵ هەردووکیانیەتی، وەکە دەش فەرموویێت: (یا أیها الذین آمنوا) واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە، دیسان لەگەڵ هەردوو ڕەگەزەکەیەتی، جاهەندێك خەڵکی سادەو سەرکێڵ دەپرسن باشە (یا أیها الذین آمنوا) ئەوە صیغەی نێرینە نیە (صیغة المذكرّ)، ئەدی بۆچی وێڕای ئەوەش نەی فەرمووە (یا أیها اللاتي آمَنَّ)؟!

ئەی ئەو ئافرەتانەی ئیمانتان هێناوە؟! جا وەڵامەکەی ئەوەیە کە لەزمانی عەرەبی‌دا صیغەی (مُذکر) بۆ هەردوو ڕەگەزەکە بەکاردەهێنرێ، جا ئایا لەبەرئەوە بێ کەڕاناوی نێرینە لەسەر زمان سوکترە! یان لەبەر هەر هۆیەك بێت، گرنگ ئەوەیە لەزمانی عەرەبی‌دا پێش هاتنی ئیسلامیش پێش‌و هاتنە

خوارەوەی قورئانیش لەزمانی عەرەبیدا هەرکاتێك نێرینەو مێینە بەیەکەوە کۆبووبنەوە ڕاناوی نێرینە بەکارهێنراوە، جا لەزمانی عەرەبیدا نێرینەو مێینە جاریَ وایە (مجازي) ین و جاری واش هەیە (حقیقي)ین بۆ وێنە، مانگ (القمر) بەنێرینە لەقەڵەم دەدرێ لەڕووی زمانەوانییەوە بەڵام خۆر (الشمس) بەمێینە، ئەوە پێی دەگوترێ (التذکیر والتانیث المجازي) جا هەرکاتێك (مذکر ومؤنث) نێرینەو مێینە کۆبوونەوە لەدواندن (خطاب)ێکدا ئەوە ڕاناوی نێرینەیان بۆ بەکاردێت، کەواتە لەهەر شوێنێك خوای پەروەردگار فەرموویەتی: (یا أیها الذین آمنوا) ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە، ئەوە پیاوو ئافرەت دەگرێتەوە، پاشان خوای گەورە لەبارەی وەك یەکبوونی ئافرەتو پیاوەوە دەفەرموێت: (وَلَهُنَّ مِثْلُ الَّذِي عَلَيْهِنَّ بِالْمَعْرُوفِ)(البقرة: من الآية٢٢٨) ئافرەتانی هەمان مافیان هەیە لەسەر پیاوان کەپیاوان هەیانەی لەسەر ئەوان بەشێوەیەکی چاك، دوایی دەفەرموێت: (وَلِلرِّجَالِ عَلَيْهِنَّ دَرَجَةٌ)(البقرة: من الآية٢٢٨)، بەڵام پیاوان پلەیەکیان هەیە بەسەر ئەوانەوە کەئەویش پلەی (مشوورخۆریو چاودێریو بەسەر ڕاگەیشتنە لەچوارچێوەی خێزاندا)، بەڵێ لەچوارچێوەی خێزاندا پیاو ئەرکی سەرشانێتی خێزانەکەی بەخێو بکاتو بیپارێزێو ئاگای لێی بێتو دیفاعی لێبکات، ئەوەش مشوورخواردنە نەك وەك کوێخایەتی بەسەرەوەکردن، چونکە کەدەفەرموێت: (الرِّجَالُ قَوَّامُونَ عَلَى النِّسَاءِ) (النساء: من الآية٣٤) (قوام) صیغەی موبالەغەی (قائم)ە ئەمیش یەعنی کەسێك بەشتێك هەڵدەستێتو شتێك ڕادەپەڕێنێت، وەکەسێك کەئیشوکارێك ئەنجام دەدات، کەواتە لەڕاستیدا پلەی (القوامة) سەرپەرشتی خێزان کەبەپیاوان سپێردراوە ئەرکو تەکلیفە نەك خەڵاتو تەشریف، ئەرکێکی قورسە خراوەتە سەرشانیان نەك پلەو ئیمتیازێك بۆ پێیان درابێ، ئێستاش باتەماشا بکەین داخۆ مافە شەرعییەکانی ئافرەتی مسوڵمان لەچیو چیدا خۆیان دەنوێنێت؟!

## یەکەم: پیاوو ئافرەت خاوەنی یەك ئەسڵو ڕەگەزو سروشتن

وەك پێشتر باسمان کرد لەخیتابو دواندنەکانی قورئانو سوننەتدا جیاوازی نەخراوەتە نێوان ئافرەتو پیاوەوە، چونکە هەردووکیان بەندەی خودانو نێرایەتیو مێینایەتیش ئیمتیاز نییە بۆ هیچیان وەکەمییش نییە بۆ هیچیان، وەلەهیچ ئایەتێکی قورئانو لەهیچ فەرمایشتێکی پێغەمبەردا ﷺ ئەصڵەن بەئیشارەش ئیشارە نەکراوە بەوەی کەپیاو لەبەرئەوەی نێرینەیە یان ئافرەت لەبەرئەوەی کەمێینەیە فەرقێکیان هەیە!! نەء بەڵکو هەر لەو ئایەتەدا کەخوای پەروەردگار باس دەکات کەئادەمیزادەکان لەدایكو باوكێك دروست بوون، هەر لەسیاقی ئەو ئایەتەدا خوای دادگەر ڕوونی دەکاتەوە کەلەپیاوانو ئافرەتان وەلەنێو گەلو میللەتاندا ئەوەیان لەلای خوا بەڕێزترە کەتەقوای زیاترەو مسوڵمانی باشترە، دەفەرموێت: (يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ ذَكَرٍ وَأُنْثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوباً وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ)(الحجرات: من الآية١٣) خوای دادگەر بانگ دەکاتە هەموو مرۆڤایەتیو دەفەرموێ ئەی خەڵکینە! ئێوەمان لەنێرو مێیەك دروست کردوە واتە: (باوكو دایکێك کەئادەمو حەووان سەلامی خوایان لێبێت) پاشان ئێوەمان کردوە بەچەند گەلێك وەبەچەند تیرەیەك تاکو یەکتر بناسن، دوایی دەفەرموێ: (إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ) بەتەئکید بەڕێزترینتان لای خوا پارێزکارترتانە، کێ تەقوای زیاتر بێت لەلای خوا حورمەتی زیاترەو ڕێزی زیاترەو پلەو پایەی بەرزترە، هەروەها لەسەرەتای سووڕەتی (النساء)دا دەفەرموێ: (يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالاً كَثِيراً وَنِسَاءً)(النساء: من الآية١) دەفەرموێ: ئەی خەڵکینە! لەو پەروەردگارەتان پارێز بکەن کەلەیەك نەفس ئێوەی خولقاندوە دوایی هەر لەو نەفسەش هاوسەرەکەی دروست کردوە، واتە لەجینسی ئەو نەفسە، کەواتە ئێمە هەموومان دەچینەوە سەر ئادەم، حەوواش کەدایکی هەموو بەشەرییەتە ئەویش هەر لەوجۆرە ڕەگەزو نەفسە کەئادەمی

لێخوڵقاوە هەر لەو نەفسە دروست بووە، کە نەفسی بەشەرییە، دیارە هەندێ فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ هەن کەهەندێ لەزانایان هێناویانن باسی ئەوە دەکەن کەئافرەت لەپەراسوو دروست بووە، جاهەندێ لەزانایان گوتوویانە مەبەست پێی پەراسووی ئادەمە کەحەووای لێدروست بووە، بەڵام زانایانی لێکۆڵەرەوە (المحققون) دەڵێن: مەبەست تەشبیهکردنی ئافرەتە بەپەراسووەوە[٥] نەگەرنا حەووا لەئادەم جیا (نەبۆتەوە ئایەتەکەش دەفەرموێ: (خلق منها) کەبێگومان (منها) ئیشارەت دەکات بە (نفس) چونکە نەفس (مؤنث)ە لەزمانی عەرەبیدا ئەگەرنا ئادەم (مؤنث) نییە!! کەواتە: واتە حەووا لەئادەم جیانەبۆتەوە بەڵکو لەوجۆرە نەفسەی کەئادەمی لێ دروست بووە حەوواش لەوجۆرە نەفسە دروست کراوە، کەواتە لەڕووی ڕەگەزو سروشتو ڕەچەڵەکی ئینسانییەوە لەو ڕووەوە کەهەردووکیان مەخلوقی خوان، وە لەو ڕووەوە کەهەردووکیان بەندەی خوان ئافرەتو پیاو لەیەك جیا نینو یەکسانن و وەك یەکن.

## دووەم: ئافرەتیش وەك پیاو فێربوونی زانستو شارەزابوونی لەسەر پێویست کراوە:

ئافرەت لەبەرئەوەی کەوەك پیاو ئینسانە بەبێ جیاوازیو وەك وی بەندەی خوایە و ئەو ئامانجەی کەئینسانی پیاوی بۆ دروست کراوە، ئینسانی ئافرەتیشی بۆ دروست کراوە، کەبریتییە لەبەندایەتی بۆ خوا لەبەرئەوە هەرشتێك بەندایەتی ئافرەت یەکی لەسەری کەوتبێ ڕێگا بەئافرەت دراوە بەڵکو لەسەری پێویست کراوە کەدابینی بکات، کەیەکێك لەوانە زانیارییە، واتە: زانیاریی بەگشتیی و بەتایبەتیش زانیاری شەرعیی وەك چۆن پیاوان

---

[٥] لەکتێبی (ئافرەتو خێزان لەسایەی شەریعەت دا) لەبەشی سێیەم دا، حیکمەتی ئەو فەرموودەیەمان جوان دەرخستووە کەبۆچی ئافرەت بەپەراسوو (ضلع) چوێنراوە؟!

موکەللەف کراون بەوەی کەبزانن خوای پەروەردگار چی لێ داوا کردوون و، چی بۆ حەڵاڵ کردوون چی لێ حەرام کردوون چ ئەمرو نەهی یەکی ئاراستەکردوون، ئافرەتانیش بەهەمان شێوە، وە سەرەڕای ئەوەی ئایەتەکان بەگشتی وا دەفەرمون، فەرموودەکاکانی پێغەمبەریش ﷺ بەگشتی هەروا دەفەرموون، بۆ وێنە، ئەو فەرموودەیەی کەدەفەرموێ: (طلب العلم فريضة على كل مسلم)[٦] رواه ابن ماجه عن انس.

داواکردنی زانست لەسەر هەر مسولمانێك پێویستە کەچ زانستی شەرعی بێت، چ هەر جۆرە زانستێکی دونیایی بێ کەژیانی مسولمانان پێویستی پێ یەتی دەیگرێتەوە، چونکە وشەی (علم) بەموتڵەقی هاتوە، جا لەسەر هەر مسولمانێك پێویستە زانیاریی پەیدا بکات، جا ئەو مسولمانە چ پیاو بێ چ ئافرەت چ ورد چ درشت، چونکە بەبێ زانست دینداریی ناکرێت، کەواتە پێویستە هەموویان زانست داوا بکەن و بەدوای زانستدا بگەڕێن تاکو ئەرکی بەندایەتی خۆیان جێ بەجێ بکەن، دیارە وشەی (علم) یش لەقورئان و سوننەتدا بەموتڵەقی هاتووە، هەربۆیەش بەکردەوەو شانبەشانی هاوەڵانی پیاو (اصحاب) خوالێیان ڕازی بێت ئافرەتانی هاوەڵ (صحابيات)یش قورئانیان لای پێغەمبەر ﷺ وەردەگرت و لەنوێژەکانی جومعەی پێغەمبەر ﷺ کە وتاری بۆ مسولمانان دەدا پیاوان لەپێشەوە بوون و منداڵەکان دەکەوتنە دوای پیاوانەوەو ئافرەتانیش دەکەوتنە دوای ئەوانەوە، بۆئەوەی کە (حاجز)ێك و نێوانێك لەبەینی پیاوان و ئافرەتاندا هەبێت، چونکە مزگەوت جێگای عیبادەت و تاعەتە نەوەکا چاویان بەیەك هەڵتۆقێ و مەشغوڵ بن، دیارە ئەوکاتە هیچ پەردەش نەبووە وەك ئێستای ئێمە شوێنێکی تایبەت بۆ ئافرەتان دەکەینەوە، شوێنی ئافرەتان لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ نەپەردەی

---

[٦] واتە: داواکردنی زانیاریی و بەدواداگەڕانی لەسەر هەر مسولمانێك پێویستە.

دیـواری هـەبووە نەپـەردەی پـەڕۆیی هـەبووە، وە ئافرەتـان لەمزگەوتـەکاندا، لەمزگـەوتی پێغەمبـەر ﷺ هـەتا هـەموو مزگەوتـەکانی دیکـە لـەوتاری گشـتی پێغەمبـەردا ﷺ بەشداریان کردوە بـەبێ جیـاوازی وەك پێشـتر باسمـان کـرد، سـەربارەش پێغەمبـەر ﷺ لەهەفتـەدا یان لـەمانگدا کاتێکیشی تایبـەت کردبـوو بەئافرەتانـەوە، کەواتـە با ئـەو حەقیقەتـە بزانـین کـەئافرەتانی مسـوڵمان بـایی ئەوەی کەبتوانن لەدینەکەیان تێبگەن وەپاشان ئەرکی سەرشـانیان بەرانبـەر بـەدینیان و، بەمیللـەتیان جێبـەجێ بکـەن نـەك هـەر ڕێیـان دراوە، بگـرە لەسەریشیان پێویست کـراوە کـەبچن زانیـاری بەگشـتی و بەتایبـەت زانیـاری شـەرعی بەدەسـت بێنـن، دیـارە بەئـەخلاقی ئیسـلامی و لەسـنووری ئـادابی شەرعی‌دا، وەهیچ کەسیش بۆی نی‌یە ڕێیان لێبگرێ، نەباب بۆی هەیە ڕێگا لەکچەکەی بگرێ، نەمێرد بۆی هەیە ڕێگە لەژنەکەی بگرێ، نەدایك بۆی هەیە ڕێ لەکچەکەی بگرێ، نەبرا بۆی هەیە ڕێگای لەخوشکەکەی بگرێ هیچ کـەس بۆی نی‌یـە ڕێ لـەئافرەتی مسـوڵمان بگـرێ جـا ئـەو ئافرەتـە چ دایـك بێـت چ هاوسەربێت چ کچ بێت، کەبچێت بایی ئەوەندەی کەبزانێت خوای گەورە چی لەسەر پێویست کردوە، وەدینی خوای بەرز چی لێ داوا کردوە بۆ دین و ژینی، بچێ لـەدینی خـوا شـارەزا بێـت، دیـارە ئەگـەر لەماڵـەوە دەسـتی کـەوت ئـەو زانیارییـەو بـابی توانـی یـان برایـەکی توانـی زۆر باشـە، بـەڵام دیسـان نـابێت ڕێگـەی دەرەوەشـی لێبگـرێ وەك دواتـر باسـی دەکـەین، ئـەوەتا هاوسـەرانی پێغەمبـەر خـوا لێیـان ڕازی بێ کەلەهـەموو ئافرەتـان بـەڕێزتر بوون وەك خـوای پەروەردگار دەفەرموێ: (يَا نِسَاءَ النَّبِيِّ لَسْتُنَّ كَأَحَدٍ مِنَ النِّسَاءِ إِنِ اتَّقَيْتُنَّ)(الأحزاب: من الآية٣٢) واتە: ئەی هاوسەرانی پێغەمبەر ﷺ ئەگەر ئەهلی تەقوابن وەك هیچ کام لـەئافرەتان نـین، واتـە ئێـوەی ئافرەتـانی پێغەمبـەر ﷺ دیـارە لەبەهەشـت لەخزمـەت پێغەمبـەردا دەبـن پێغەمبـەریش پلـەی لەهـەموو کـەس بـەرزترە خێزانەکانیشی لەگەڵ خۆیدان، کەواتـە: بۆیـەش پایـەیان یـەکجار بـەرز دەبێ،

هەر تەقواو تاعەتێك كە لەسەر خێزانەكانی پێغەمبەر ﷺ پێویست كراوەو كۆمەڵێك تایبەتمەندی كەبۆ ئەوان دانراون، ئافرەتانی دیكەی ئوممەت بەو شێوە لەسەریان پێویست نەكراون، بۆ وێنە: مەسەلەی (حیجاب) دیارە حیجاب ئەوە نییە كەئێستا ئێوە لەبەرتانە چونكە ئەوە پۆشاكە پێ‌دەڵێن (الستر)، بەڵام حیجاب یانی (پەردە) وە ئایەتی حیجاب واتە: ئەو ئایەتەی كەبۆ چۆنیەتی قسەكردنی پیاوانی هاوەڵ لەگەڵ خێزانەكانی پێغەمبەردا ﷺ هاتە خوارەوە، چونكە پیاوانی مسوڵمان كەجارێ ئایەتی حیجاب نەهاتبوە خوار لەكاتی پێویستی‌یەكدا رووبەڕوو لەگەڵ خێزانەكانی پێغەمبەر ﷺ قسەیان دەكرد، بەڵام دوای هاتنە خوارەوەی ئایەتی حیجاب كە لەسوورەتی (الاحزاب) دایەو دەفەرموێ: (وَإِذَا سَأَلْتُمُوهُنَّ مَتَاعاً فَاسْأَلُوهُنَّ مِنْ وَرَاءِ حِجَابٍ)[7] (الأحزاب: من الآية٥٣) ئیدی پاش ئەوە خوای پەروەردگار پەردەی گرتنەوەی لەسەر هاوسەرانی پێغەمبەری خوا فەرز كردوەو دروست نەبووە بەبێ پەردە گرتنەوە لەگەڵ خێزانەكانی پێغەمبەردا ﷺ قسە بكرێت، جا حیجاب لەسەر ڕای زۆربەی هەرەزۆری توێژەرەوانی قورئان و شەرعزانان تایبەتە بەخێزانەكانی پێغەمبەرەوە ﷺ هەروەها هەندێ شتی دیكە كەلەسورەتی (الاحزاب)دا هاتوە تایبەتە بەخێزانەكانی پێغەمبەرەوە ﷺ بۆ وێنە: ئەوە كەدوای وەفاتی پێغەمبەر ﷺ هاوسەرەكانی بۆیان نەبووە شووبكەنەوە تایبەت بووە بەخێزانەكانی پێغەمبەرەوە، ﷺ ئاوا دایكانی مسوڵمانان خوا لێیان ڕازی بێ كۆمەڵێك تایبەتمەندییان بۆ هەبووە، لەبەرئەوەی مەقامیان بەرزتر بووە دیارە ئەركیشیان قورستر بووە، جا لەگەڵ ئەوەشدا تەماشا دەكەین خێزانەكانی پێغەمبەر ﷺ خوا لێیان ڕازی بێت زۆر لە ئیسلام دا شارەزا بوون جا چ بەهۆی ئەوەوە كەڕاستەوخۆ لەپێغەمبەری خوا وەریان گرتوە وە چ

---

[7] واتە: وەئەگەر پێویستی‌یەكتان لێیان خواست لەپشت پەردەوە لێیان داوا بكەن..

بەهۆی ئەوەوە کە لەبۆنەکاندا بەشداریان کردوە، لەجومعەدا، لەنوێژی جەژنەکاندا لەنوێژی خۆرگیراندا، لەنوێژی باران بارینو لەجەنگەکاندا چونکە ئافرەتانی مسوڵمان ئەگەر نەچنە نێو کۆمەڵگاو، ئەگەر لەبۆنە گشتییەکاندا بەشدارنەبێو نەچێتە نێو خەڵك، نازانێت خێرو شەڕی خەڵك چییە، (عائیشە) خوای لێی ڕازی بێت خێزانی پێغەمبەر ﷺ بووە بەڵام لە (صحیح بخاری) دا هاتوە کەکاتێ ئافرەتێکی مسوڵمانیان بۆ مێردەکەی دەگواستەوە (بووك بوو) عائیشە بۆ مێردەکەی برد، ئافرەتی مسوڵمان ئەگەر نەچێتە نێو کۆمەڵگاوە نازانێت خێرو شەڕی کۆمەڵگا چییە نازانێت (مەعروف) چییەو (مونکەر) چییە تاکو دوایی ئەمر بەمەعروفو نەهی لەمونکەر بکات، عائیشە خوا لێی ڕازی بێت لەدوای (أبو هريرة) لەهەموو هاوەڵانی دیکە ئەوەی بێتەوە یادم زیاتر فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ گێڕاوەتەوە[8]، ئەصحاب خوا لێیان ڕازی بێت زۆرجار لەشتێکدا دەکەوتنە کێشەو مشتومڕەوە بەتایبەت لەمەسەلەکانی حەڵاڵو حەرامو بواری خێزانو هەڵسوکەوتی نێوان ژنو مێردو ئەوانەدا، ئیدی کەدەچوونە لای عائیشەو پرسیاریان لێدەکرد ئیشکالەکەی بۆ حەل دەکردن، وە بەدرێژایی مێژوو جگە لەهاوسەرە بەڕێزەکانی پێغەمبەر ﷺ هاوسەرانی چوار خەلیفە ڕاشیدەکانو وەهاوسەرانی زانایانیش دەوری گرنگیان بینیوە لەو بوارەداو هەیان بووە تەفسیری قورئانی کردوەو هەیان بووە فەرمایشتناس (محدثة) بووە هەیان بووە شەرعزان (فقيهة) بووەو فەتوای داوە، وە (ئەبوو حەنیفە) ڕای وایە کەئافرەت لەچەند بوارێك دا بۆی هەیە ببێتە قازی وەکاتێ خۆی ئافرەتانی شارەزا زۆربوونو چەندەها ئافرەت هەبوونە جگە لەوەی هەموو قورئانیان لەبەر بووە (صحيح البخاري) و (صحيح

---

[8] عائیشە خوا لێی ڕازی بێت (٢٢١٠) فەرموودەی گێڕاوەتەوەو لەدوای (ابوهريرة) و عبدالله ابن عمرو (انس بن مالك)ەوە و لەپلەی چوارەم دا دێ لەو بوارەدا، خوا لەهەموویان ڕازی بێت، بڕوانە (علوم الحديث ومصطلحه) د. صبحي صالح، ص ٣٦٤، ٣٦٥.

مسلم)یـان لەبـەر بـووە، وە لـەکاتێکدا کـەوەزعی مسـوڵمانان لەچڵەپۆپـەی دەسەڵاتو گەشەکردنی زانستدا بوو هیچ پێشەوایەکی مسـوڵمان نـەیگوتوە ئافرەت بۆی نیە بچێتە دەرەوەو زانست وەربگرێ و شارەزابێت چ لەدینداو چ لەژین دا.

**سێهەم: ئافرەتان بۆیان هەیە لەبۆنە گشـتی‌یەکان و جێبـەجێکردنی درووشمەکاندا بەشدار بن:**

ئـافرەت ڕێی پێـدراوە کەبەشـداری ئـەنجام درانـی سـەرجەم جۆرەکـانی عیبـادەت بکـات، واتـە ئـەو عیبادەتانـەی کـە بەکۆمـەڵ دەکرێـن وە هـەروەها بەشـداری جێبـەجێکردنی دروشمـەکانی دینداریـیو مسـوڵمانەتی بکـات، وە بەشداری بۆنەو موناسەبە شەرعییەکان بکات، لە (صحيح البخاري) و (صحيح مسلم) دا هاتوە ئافرەتان ئەوە هیچ کە بۆ نوێـژی جومعە دەچوون، بەڵکو بۆ هەرکام لەنوێژی باران بارینو نوێـژی دوو جەژنەکانو مانگو خۆر گیرانیش هـەر دەچـوون، وە پێغەمبـەر ﷺ وەك لـە (الصحيـح البخـاري)دا هـاتوە فەرموویـەتی: بـۆ نوێـژی جەژنـەکان (دیـارە سـوننەتە نوێـژی جەژنـەکان لەدەرەوەی مزگەوت بکرێو، ئەگەر دونیا قوڕو چڵپاو نەبێت وا باشە لەساراو بیابانێکدا بکرێ)، ئافرەتانیش لەگەڵ خۆتان بەرنە دەرەوە چ ئەوانەی کەپاکن بۆیـان هەیـە نوێـژ بکەن چ ئەوانەشی بێ‌نوێژن ئـەوانیش بـەرن ئەوانەی کـەبێ نوێژن فەرموویەتی باگوێ یان لەقسەی خێر بێتو هەرچەندە نوێژ ناکەن بەڵام بالەگۆشەیەکی ئەو نوێژگە (مصلى)یە وە بۆ خۆیان دانیشن بەشداری نوێژەکە نەکەن چونکە بێ‌نوێژن بەڵام باهەر بێنو بەشدار بن، جا ئایا حیکمـەتی ئـەوە کەئیسلام دایناوە کەئافرەتان بەشداری ئەو بۆنەو موناسەباتانە بکەن چی‌یە؟!

لەڕاسـتی‌دا گـەورەترین حیکمـەتی وەك لـەدەقی فەرموودەکەشـدا هـاتوە ئەوەیـە کـەئافرەت چـاوی بکرێتـەوەو دڵـی خـۆش ببـێ بـەو کۆبونەوەیـەی مسـوڵمانان، وە قسـەی خـێر دەبیسـتێتو ئاگـاداری کێشـەکانی مسـوڵمانان

دەبێت و ئاگاداری حاڵ و وەزعیان دەبێ، ئینجا دیارە دوای ئەوەی کەبەرچاوی ڕوون دەبێتەوەو ئاگادار دەبێ و لەدین و ژین تێدەگات، ئەوجار دەتوانێت دەور ببینێ لەکۆمەڵگادا، ئەگەر نا ئافرەتێك هەر لەماڵی خۆی بێت و ئاگای لەدونیا نەبێت و نەزانێت خێر چی یەو شەڕ چی یەو نەزانێ دونیا چی لێهات و نەزانێت وەزعی مسوڵمانان چۆنە؟! چۆن دەتوانێت لەو کۆمەڵگایەدا هیچ کاریگەرییەکی هەبێت و هیچ دەورێك ببینێ!!

**چوارەم: ئافرەتان بۆیان هەیە لەسەرجەم چالاکی سیاسی و کۆمەڵایەتی و جیهادیەکان دا بەشدار بن.**

برگەی چوارەم لەمەسەلەی مافە شەرعییەکانی ئافرەتان ئەوەیە کەئافرەتان ڕێگەیان پێ دەدرێت بەڵکو لەسەریان پێویست دەکرێت وەك دوایی باسی دەکەین کەهەرچی چالاکی کۆمەڵایەتی و سیاسی و تەنانەت جیهادیش هەیە ئافرەتان مافی خۆیانە تێیان دا بەشدار بن، بۆ وێنە: لە ژن و ژنخوازیی و شین و تەعزیەو ڕۆژانی شادیی و ڕۆژانی ماتەمینی دا ئافرەتان وەك پیاوان بۆیان هەیە بەشداری بکەن، بەڵام بێگومان بەئادابی شەرعییەوە، کەواتە ئەوەی ئێستا بۆتە عادەت و باوو ئافرەتان لەشارەکانی وەك سلێمانی و هەولێرو هتد دا.. لە(تازیەکان) دادەنیشن و جا یەکێکیان بەمردووەکە هەڵا دەڵێن و گۆرانی پێدا هەڵا دەڵێ و ئەوانی دیکە هەموو بەکۆڕس دەگریەن، ئەوە لەڕاستیی دا کارەکەیان لەئەسڵ دا شەرعی یە، بەڵام چۆنیەتی و شێوەیەکەی ناشەرعی یەو شتێکی نەفامانەیە، ئەگەرنا وەك چۆن سەرەخۆشیی و دڵدانەوەی مردوو بۆ پیاوان سوننەتە بۆ ئافرەتانیش هەر سوننەتە، هەروەها وەك چۆن بەشداریی کردنی یەکتر بۆ ڕۆژانی شادیی و خۆشی و هەرچی بۆنەو موناسەباتی شەرعی یانەی نێو مسوڵمانان

هەیـە چ هـی دینـی چ هـی دونیـایی وەك چۆن بـۆ پیـاوان هەیـە تێیـاندا بەشداربن بۆ ئافرەتانیش هەیە بەهەمان شێوە، هـەروەها چالاکی سیاسی هەروەك چۆن پیاو بەرپرسیارە بەرانبەر بەمیللەتی، بەرانبەر بەکۆمەڵگای، بەرانبـەر بـەخاك و وڵاتـی ئـافرەتیش بەرپرسـیارە، وەلـەڕووی جـەنگ و جیهادەوە کەئەوەیان زۆر شتێکی تایبەتمەندی‌یە بۆ پیاوان لەو بوارەشدا هەرچـەندە ئافرەتـان خاتریـان گیراوەو جـەنگ و جیـهادیان لەسـەر فـەرز نەکراوە، بەڵام دیسان ئافرەت ڕێی پێدراوە کەئەگەر توانای هەبوو بەشداری بکات، وە ئافرەتانی هاوەڵان (النساء الصحابيات ) و خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ لەجەنگەکاندا بەشدار دەبوون و لەبۆنە سیاسیەکان دا بەشدار دەبوون، تەماشـای ئـەو ئایەتـە بکـەن لـەکۆتایی سـوورەتی (الممتحنـة)دا خـوای پەروەردگار دەفەرموێ: (يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا جَاءَكَ الْمُؤْمِنَاتُ يُبَايِعْنَكَ عَلَى أَنْ لَا يُشْرِكْنَ بِاللَّهِ شَيْئاً وَلَا يَسْرِقْنَ وَلَا يَزْنِينَ وَلَا يَقْتُلْنَ أَوْلَادَهُنَّ)(الممتحنة: من الآية١٢)

جا دیارە بەیعەت دان بەسەرۆکی دەوڵەت ئەوە مەسەلەیەکی سیاسی زۆر گەورەیە کەدەبێ ئافرەتـانیش تێیـدا بەشـداربن، بۆیـە خـوای دادگـەر دەفەرموێ، ئەی پێغەمبەر ﷺ هـەرکاتێك ئافرەتـانی مسوڵمان هـاتن بـۆلات بەڵێنت پێ‌دەدەن و بەیعەتت پێدەکەن کەهیچ شتێك نەکەنە هاوبەشی خواو دزیی نەکـەن و زینا نەکـەن و کۆرپـەکانیان نـەکوژن و بوختـان هەڵنەبەسـتن (فبايعهن واستغفرلهن الله) دەجا تۆش بەڵێنیان لـێ وەربگـرەو پـەیمانیان لـێ‌وەربگرە (وەك چـۆن لـەپیاوان وەردەگـری) وە داوای لێبوردنیشـیان بـۆ لەخوا بکە، واتـە: ئەگـەر کەم‌وکورپیـەکیان هـەبوو بفـەرموو خوایـە لێیـان خۆشبە، ئینجا هەر چوار خەلیفە ڕاشیدەکان کە هەڵبژێردراون ئافرەتانیش لەپرس و ڕاوێژدا بەشداربوون، بەبەڵگەی ئەوەی کە (عبدالرحمن بن عوف)

لەهەڵبژاردنی خەلیفەی سێیەم دا کەلەنێوان (عثمان) و (علـي)دا خوا لێیان ڕازی بێت تیا مابوون کامیان هەڵبژێرن (عبدالرحمن) دەڵێت: ئەو شەوە نەخەوتم، شەوی پێش کۆتایی دەڵێ پرسیارم بەئافرەتانیش کرد بەکچانی پشت پەردەش کرد (واتە ئەو کچانەی کەمتر دێنە دەرەوە دیارە کچ شەرمو شکۆی زیاترە)، بەڵێ ڕاوێژو پرسم بەوانیش کرد کەئایا کێتان پێ باشە ببێ بەخەلیفە (عثمان) یان (علی) یان کێ؟! کەواتە ئەوە کەهەندێك کەس بەبێ ئەوەی شارەزایی مێژووی ئیسلام بن یا شارەزایی قورئانو سوننەت بن، هەر لەخۆوە دێن ئەو مافانە لەئافرەتان زەوت دەکەنو دەڵێن: ئافرەت بۆی نییە ڕەئی هەبێو ئافرەت بۆی نییە لەشورادا بێو ئافرەت چی پەیوەندی بەکاروباری دەوڵەتەوە نییە!! ئەوە هیچی وا نیە وەك بەڕوونی لەو زنجیرە وتارەمان دا کە لەڕۆژنامەی (کۆمەڵ)دا بڵاودەکرێتەوە دوایی دەیکەین بەکتێبێك إن شاء الله بەناوی (ئافرەتو خێزان لەسایەی شەریعەتدا) زۆر بەڕوونی باسی ئەو شتانەمان کردووەو بەڵگەشمان لەسەر هێناونەتەوە، وە بەڕاستی هەر ئەم ئایەتە بەسە بۆ ئیسپاتی ئەوە کەهیچ کەسێك بۆی نییە ڕێگەی هیچ جۆرە چالاکیەکی فیکریی، فەرهەنگی، سیاسی، کۆمەلایەتی، جیهادیی لەئافرەتان بگرێ، ئەو ئایەتەی کە لەسوورەتی (التوبة) دەفەرموێ: (وَالْمُؤْمِنُـونَ وَالْمُؤْمِنَـاتُ بَعْضُـهُمْ أَوْلِيَـاءُ بَعْضٍ يَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنْكَرِ وَيُقِيمُونَ الصَّلاةَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَيُطِيعُـونَ اللَّـهَ وَرَسُولَهُ أُولَئِكَ سَيَرْحَمُهُمُ اللَّهُ إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ) (التوبة: ٧١)

کەخوای پەروەردگار باسی ئافرەتانو پیاوان دەکات، وەدەفەرموێ: وەپیاوانی بڕوادارو ئافرەتانی بڕوادار (بعضهم أولیاء بعض) پیاوانیش سەرپەرشتیاری ئافرەتانن، ئافرەتانیش سەرپەرشتیاری ئەوانن، کەواتە

دەبێ هەردووك لایان دەستبار بۆ یەكتری بگرن لەهەموو ڕووەكانی ژیانەوە، پاشان خوای پەروەردگار، شەش بوار دیاری دەكات بۆ ئەو مشوورخۆریو هاوكارییو پشتگیرییكردنی یەكترەی ئەو دوو ڕەگەزەو دەفەرموێ: ﴿يَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَيُقِيمُونَ الصَّلاةَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَيُطِيعُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ﴾(التوبة: من الآية٧١) شەش شتان دیاری دەكات كەلەو شەش بوارەدا ئافرەتانو پیاوان دەستبار بۆ یەكتر بگرنو سەرپەرشتی كۆمەڵگاو میللەتی خۆیان بكەنو دەفەرموێ: (فەرمان بەچاكە دەكەنو قەدەغەی خراپە دەكەن) خوشكەكانم! وشەی (معروف) لەزمانی عەرەبیدا لەبەرئەوەی كە (ئەلفو لامی) ی لەسەرە (الألف واللام للجنس) واتە بۆ ئەنجامدانی هەرچی چاكەیە ئافرەتانو پیاوان دەبێ دۆستو پشتیوانی یەكتر بنو دەست بار بۆ یەكتر بگرنو هەوڵ بدەن بیچەسپێنن، جا ئەو چاكە (معروف) یە لەهەر ڕوویێكو لەهەر بوارێكدا بێت: لەڕووی: عەقیدە، عیبادەت، ئەخلاق، لەڕووی سیاسییەوە، لەڕووی كۆمەڵایەتییەوە، لەڕووی فەرهەنگییەوە.. هتد .. ئافرەتانو پیاوان دەبێ دەست باری یەكتری بگرنو هەوڵبدەن هەموو جۆرەكانی چاكە بچەسپێنن، دیارە (معروف) یش واتە شتی باش هەر شتێك كەشەرعی خوا بەپەسەندی دانابێو عەقڵی ئینسانیش پێی پەسەند بێت بێگومان هەر شتێكیش شەرعی خوا بەچاكی دانابێت عەقڵیش پەسەندی دەكات، وە (منكر)یش یانی خراپ، بەكەڵك نەهاتوو، زیان بەخش، دیسان لەبەرانبەر مونكەریشدا ئافرەتانو پیاوان دەبێت دەستبار بۆ یەكتری بگرنو ئافرەتیش وەكو پیاو بەرپرسیارە لەبەرانبەر ئەو مونكەرانەی كەلەكۆمەڵگاكەیدا هەیە، جا مونكەر عەقیدەیی بێ وەك: شیرك، نیفاق، كوفر، ئیلحاد، ئەوە هەم پیاوو هەم ئافرەتیش لەبەرانبەریدا

بەرپرسیارن کە لای بەرن دیارە بەو شێوازە ڕاستو دروستەی کەشەریعەت دیاری کردوە، هەروەها لەهەموو بوارەکانی دیکەی عیبادەتو ئەخلاقو، هەڵسوکەوتو کۆمەڵایەتیو سیاسیو ئابووریو، مامەڵەو بازرگانیو عاداتو نەریتو هتددا.. پیاو و ئافرەت وەك یەك لەبەرانبەر ناشەرعی‌یەکانی نێو کۆمەڵگاکەیاندا بەرپرسیارن کەکۆمەڵگاو میللەتەکەیان لەخراپەو ناشەرعی‌یەکان بژار بکەنو پاك بکەنەوەو بەچاکەکان بیڕازێننەوە، واتای فەرمان بەچاکەو قەدەغەکردنی خراپە ئەوەیە کەگوتمان، ئینجا بواری سێیەمو چوارەم (ویقیمون الصلاة ویؤتون الزكاة) نوێژ بەرپادەکەنو زەکات دەدەن، نوێژو زەکات کە زۆرجار لەقورئانێ پێکەوە هاتوون، دوو دروشمو نیشانەی گەورەو گرنگی مسوڵمانەتین، چونکە نوێژ حەقی خوایەو زەکات حەقی خەڵکە، نوێژ هەقێکی ڕووحی‌یە، زەکات حەقێکی ماددی‌یە، جائافرەتانو پیاوان دەبێت وەکو یەك ئەو دوو هەقەش ئەنجام بدەنو ئەو دوو ئەرکەش جێبەجێ بکەن (ویطیعون الله ورسوله) ئەرکی پێنجەمو شەشەم فەرمانبەریی خواو پێغەمبەری خوا ﷺ دەکەن واتە: قورئانو سوننەت جێبەجێ دەکەن، جێبەجێکردنی قورئانو سوننەتیش کەفەرمانبەریی خواو پێغەمبەری خوای تێدایە ئەوە ئەرکی سەرشانی هەرکام لەپیاوانو ئافرەتانە، دوایی دەفەرموێت: (أولئك سیرحمهم الله) پیاوانو ئافرەتانێك خوا بەزەیی پێیاندا بێتەوەو لێیان خۆش دەبێ کە ئەو شەش ئەرکە جێبەجێ بکەن، ئەوە بەکورتی دەربارەی مافە شەرعییەکانی ئافرەتی مسوڵمان ئینجا بچینە سەر تەوەرەی دووەمو بێینە سەر باسی ئەرکە گرنگەکانی ئافرەتی مسوڵمان:-

# تەوەرەی دووەم

## ئەركە گرنگەكانی ئافرەتی مسوڵمان

لەسۆنگەی ئەوەوە كەهەركەسێك مافی بۆ دابین نەكرێ ئەركی بۆجێبەجێ ناكرێ، بۆیە من پێشێ باسی مافەكانم كرد، ئافرەتانی ئێمە یان ئافرەتانی مسوڵمانی كورد، خوشكانی ئێمە ئەگەر لەدینی خوا شارەزا نەبن و ئەگەر بواریان پێ نەدرێ و لەماڵەكانی خوادا بەشداری عیبادەت و ئەنجامدانی دروشمەكان بن، وە ئەگەر لەبۆنەو موناسەبەتەكاندا بەشداری نەكەن و ئاگاداری خێرو شەڕی كۆمەڵگا نەبن و دەورو نەقشیان نەبێ لەنێو خەڵك و میللەتداو پرسیان پێ نەكرێ و حسابیان بۆ نەكرێ، بەتەئكید ناتوانن ئەركەكانی سەرشانیان جێبەجێ بكەن، زۆرجار پیاوان رەخنە دەگرن لەئافرەتان كەئافرەتان وەك پێویست ئەركی خۆیان جێبەجێ ناكەن و دەوری خۆیان نابینن؟! بەڵام لەڕاستیدا من قەناعەتم وایە كەئێمە وەك پیاوان پێش ئەوەی گلەیی لەئافرەتان بكەین دەبێ گلەیی لەخۆمان بكەین و سەرنج بدەین داخوا تاچ رادەیەك زەمینەمان رەخساندوە بۆ ئافرەتان وەبارودۆخمان بۆ هەموار كردوون تاكو دوایی بتوانن ئەركەكانی سەرشانیان جێبەجێ بكەن!! بۆیە لەتەوەرەی یەكەمدا باسی مافەكانمان كرد، وەبەڕاستی هەر كۆمەڵگایەك بیەوێت ئافرەتەكانی بەشێوەیەكی باش ئەركی سەرشانیان جێبەجێ بكەن دەبێ بەجۆرێكی باش مافەكانیان بۆ دابین بكەن، چونكە بەئەندازەی ئەوە كەهەق و ماف بۆ كەسێك دابین دەكەی هەقیشت هەیە گلەیی لێبكەی، هەركات كەمتەرخەمی كرد لەجێبەجێكردنی ئەركی سەرشانیدا، جا با بزانین ئەركە گرنگەكانی ئافرەتی مسوڵمان چین؟! پێشتر باسمان كرد كەئافرەت وەك پیاو لەبەرانبەر دینی خوادا بەرپرسیارە، واتە هەموو ئەو مافانەی بەپیاو دراون بەئافرەتیش دراون و سەرجەم ئەو ئەركانەی لەسەر پیاو پێویست كراون

لەسەر ئافرەتیش پێویست کراون بەڵام لەهەندێ ئەرکدا خاتری ئافرەتان گیراوە! بۆ وێنە: نوێژی جومعەیان لەسەر پێویست نەکراوە، جا ئایا ئافرەتان ئەگەر بچن بۆ (جومعە) نوێژەکەیان لەکۆڵ دەکەوێ یان نا؟! بەڵێ، نوێژەکەیان بۆ بەر دەکەوێ، وە بێگومان خێریشیان دەگات وە ئەگەر بتوانن بچن سوودێکیش وەردەگرن وەبەڕاستی من تێبینیم هەیە لەسەر خوشکان کەڕەنگە وەك پێویست نەیەن بۆ نوێژەکانی جومعە، جاچ مزگەوتێ جیهاد یان مزگەوتەکانی دیکە، با خوشکانمان بێن، چونکە هەفتانە زۆر شت باس دەکرێ مامۆستایەکان باسی زۆر شتی بەسوود دەکەن، کەخوشکانی بەڕێزمان پێویستە گوێبیستی بن، وەنابێ خوشکان چاوەڕێ بن تەنها باسی مەسەلەی ئافرەتان بکرێ ئەوجار گوێ بگرن! ئەگەر خوشکان وا تەسەوڕ بکەن مانای وایە پێیان وایە ئەرکی سەرشانیان بەس ئەرکە ئافرەتانەییەکان (الواجبات النسوية)ن!! بەڵام وا نیيە چونکە ئەرکە شەرعیەکان دوو بەشن، بەشێکیان پیاوان و ئافرەتان تیایاندا بەشدارن، وەك ئەندامانی نێرو مێی کۆمەڵگا، وەبەشێکیان دووجۆرن، جۆرێکیان تایبەتن بەئافرەتانەوەو، جۆرێکیشیان تایبەتن بەپیاوانەوە، ئەنجا ئەرکە گرنگەکانی ئافرەتانی مسوڵمان هەمان ئەو ئەرکە گرنگانەن کەلەسەرشانی پیاوانن جگە لەهەندێ شت وەك نوێژی جومعەو جەنگ و جیهاد کەئەویش ئافرەت لێی قەدەغەنەکراوە بەڵکو تەنیا لەسەری پێویست نەکراوە، بەڵام ئەگەر بتوانێ ئەنجامی بدات مسوڵمانان دەبێ زۆر مەمنوونیشی بن، وەجاری واش هەیە پێویستە بەشداربن، لەو حاڵەتانەدا کەجەنگ لەسەر هەمووان فەرز دەبێ، وە لەرۆژگاری پێغەمبەری خوا ﷺ و خەلیفە ڕاشیدەکانیشیدا لەجەنگەکاندا ئافرەتانی مسوڵمان بەشدار دەبوون، چێشتیان بۆ جەنگاوەرەکان لێدەناو لەپشتی جەبهە بریندارەکانیان دەرمان دەکردو جەنازەکانیان دەبردەوە پشتی جەبهەو ئاویان بۆ ساز دەکردن و خزمەتی موجاهیدەکانیان دەکرد، وەهەندێك لەئافرەتان کەتوانای

بەدەنیو جەستەییان هەبوو وەشەڕزان بوون بەکردەوەش لەکاتی پێویست دا بەشداریشیان دەکرد، وەك نوسەیبەی کچی کەعبو ئافرەتانی دیکەش، وە ئەگەر تەماشای ئەو ئایەتە بکەین بۆمان دەردەکەوێت کەئەو ئەرکە گرنگانەی لەسەرشانی ئافرەتی مسوڵمانن هەر ئەو ئەرکانەن کەلەسەر پیاوانیش پێویست کراون، خوای پەروەردگار لەئایەتی ژمارە (٣٥) سووڕەتی (الاحزاب)دا دە (١٠) ئەرك دێنێ یان (١٠) وەسف دێنێ هەم پیاوانی پێوەسف دەکاتو هەم ئافرەتانیش وە لەکۆتایی وەسفەکاندا دەفەرموێ: ئا ئەوانە خوای پەروەردگار لێبووردنو پاداشتێکی گەورەی بۆ داناون کەواتە هەرکەسێك بەتەمای پاداشتی خوایە بەتەمای ئەوەیە خوا لێی ببوورێو بیباتە بەهەشتێ، چ پیاو بێ چ ئافرەت با ئەو دە (١٠) سیفەتە لەخۆیدا بێنێتەدی، خوا تبارك وتعالى دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الْمُسْلِمِينَ وَالْمُسْلِمَاتِ وَالْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ وَالْقَانِتِينَ وَالْقَانِتَاتِ وَالصَّادِقِينَ وَالصَّادِقَاتِ وَالصَّابِرِينَ وَالصَّابِرَاتِ وَالْخَاشِعِينَ وَالْخَاشِعَاتِ وَالْمُتَصَدِّقِينَ وَالْمُتَصَدِّقَاتِ وَالصَّائِمِينَ وَالصَّائِمَاتِ وَالْحَافِظِينَ فُرُوجَهُمْ وَالْحَافِظَاتِ وَالذَّاكِرِينَ اللَّهَ كَثِيراً وَالذَّاكِرَاتِ أَعَدَّ اللَّهُ لَهُمْ مَغْفِرَةً وَأَجْراً عَظِيماً﴾ (الأحزاب:٣٥)

خوشکە بەڕێزەکانم: ئەم (١٠) سیفەتە خوای پەروەردگار وەك یەك بۆ پیاوانو بۆ ئافرەتانی بڕیار داون کەدەبێ هەموویان خۆیان بەو (١٠) سیفەتە برازێننەوەو خاوەنی ئەو (١٠) سیفەتە بن ئەو جار شایستەی لێبووردنی خواو شایستەی پاداشتی خواو بەهەشتی خوا دەبن دەفەرموێ: (بەڕاستی پیاوانی مسوڵمانو ئافرەتانی مسوڵمان، وە پیاوانی ئیماندارو ئافرەتانی ئیماندار (چونکە هەیە هاتۆتە نێو ئیسلامەوە بەڵام جارێ ئیمانی نەچۆتە نێو دڵەوە) وە پیاوانی گەردن کەچ بۆ خواو ئافرەتانی گەردن کەچ، وەپیاوانی ڕاست لەگەڵ خواو خەڵكو ئافرەتانی ڕاست، پیاوانی خۆڕاگرو ئافرەتانی خۆڕاگر، وە پیاوانی مل کەچ لەکاتی تاعەتدا بۆ خواو ئافرەتانی خاوەن

خشـوع، وەپیـاوانی مـاڵ بەخشـەرو ئافرەتـانی مـاڵ بەخشـەر، وەپیـاوانی ڕۆژووگرو ئافرەتـانی ڕۆژووگـر، وەپیـاوانێك کـەداوێنی خۆیـان دەپـارێزن وە ئافرەتێك کەداوێنی خۆیان دەپارێزن، وەپیاوانی زۆر خوا لـەیادو ئافرەتـانی زۆر خـوا لـەیاد، ئا ئەوانـە خـوا لێبـوردنو پاداشـتێکی مـەزنی بـۆ دانـان)، وە لەئایـەتێکی دیکـەی سوورەتی (آل عمـران) لەسـیاقی چـەند ئایـەتێکدا خـوای پـەروەردگار لەمـەقامی (مەدح)دا باسـی کۆمـەڵێك لەعـەبدەکانی خـۆی دەکـات کەبـەخاوەن عـەقڵو بەئـەهلی زیکـرو فیکـر دایـناون، جـا دوای ئـەوە کـەڕازو نیازیان باس دەکات، دەفەرموێ: (فاستجاب لهم ربهم) پـەروەردگاریان وەڵامـی دانەوە (وەڵامی ڕازو نیازو پاڕانەوەو دوعایەکانی دانـەوە). (أَنِّـي لا أُضِيـعُ عَمَـلَ عَامِلٍ مِنْكُمْ مِنْ ذَكَرٍ أَوْ أُنْثَى بَعْضُكُمْ مِنْ بَعْـضٍ)(آل عمـران: من الآيـة١٩٥) پـەروەردگاریان وەڵانی دانەوە ئەوان لەخوا پاڕانەوە زۆر بەکوڵ ئەو ئایەتانە کەدەفەرموێ: (إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَاخْتِلافِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ لَآياتٍ لِأُولِي الْأَلْبَابِ، الَّذِينَ يَذْكُرُونَ اللَّهَ قِيَاماً وَقُعُوداً وَعَلَى جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ رَبَّنَـا مَـا خَلَقْـتَ هَذَا بَاطِلاً سُبْحَانَكَ فَقِنَا عَذَابَ النَّارِ) (آل عمران: ١٩٠-١٩١)

دوای پاڕانەوە ڕازو نیازێکی زۆر بەکوڵیان دەفـەرموێ: پـەروەردگاریان وەڵامـی دانەوەو فەرمووی دوعایەکەتانم قبووڵە (أَنِّي لا أُضِيعُ عَمَلَ عَامِلٍ مِنْكُمْ) بێگومـان من کردەوەی هیچ خاوەن کردەوەیەك لـەئێوە زایـە ناکـەمو پاداشـتی دەدەمـەوە (من ذکر وانثی) چ نێر بێ چ مێ (بعضکم من بعض) ئـەو نـێرو مێیانـە ش لەیەکترنو دەچنەوە سەر باوكو دایکێك، ئینجا پێنج مـەرجی بـۆ داناون تـاکو بزانن کـەخوا بەگوێرە دووعاکـەیان وەرناگرێت، بـەڵکو ئـەو ئـافرەتو پیاوانـە دەبێ خاوەنی ئەو پێنج سیفەتە بن ئـەوجار خـوای پـەروەردگار بەدەنگیانـەوە دێتو ڕازو نیازیان قبووڵ دەفەرموێ و پاداشتیان دەداتـەوە (فالذین هـاجروا) ئەوانـەی کـەکۆچیان کـردوە (واخرجـوا مـن دیـارهم) لـەماڵو حـاڵی خۆیـان وەدەرنـراونو نیشـتمانیان بەجێهێشـتوە، کۆچکـردن (هجـرة) ئەوەیـە

بەئیختیاری خۆت کۆچ بکەیت، وەدەرێ نران (إخراج)یش ئەوەیە کە بە تۆبزیی وەدەرێ بنرێی (وأوذوا في سبيلي) وە لەرێی مندا ئازاردراون (وقاتلوا) وە لەرێگەی مندا جەنگیان کردوە (وقتلوا) وە لەپێناوی مندا کوژراون، کەواتە ئافرەتانیش دەبێ جەنگو جیهادیان هەبێ، وەدەبێ هیجرەتیش بکەنو ئامادەبن لەنیشتمانی خۆشیان وەدەربنرێنو ئازاریش بدرێنو بشکوژرێن، ئەوجار شایستەی ئەوە دەبن کەخوای کاربەجێ دووعاکەیان قبوولْ بکات وەرازو نیازەکەیان لێوەربگرێ، ئێستاش با لەچەند برگەیەکدا ئەرکە گرنگەکانی ئافرەت دیاری بکەین، جامن ئەو ئەرکانەم لەپێنج بوارانداد دیاری کردوون:

**ئەرکی یەکەم: ئینسان چ پیاو چ ئافرەت بەر لەهەر کەسێك بەرانبەر بەخۆی بەرپرسیارە،** بەرانبەر بەخۆی کەباش لەدینەکەی تێبگات، عیبادەتەکەی باش ئەنجام بدات، ئەدەبو ئەخلاقی ئیسلامی لەخۆیدا بێنێتەدی، نەفسی خۆی تەزکیە بکات، خاوەنی تەقوابێ، خاوەنی رەوشتی جوانو بەرزبێ، وەخاوەنی روالەتو سیمای مسولْمانانە بێ، تێبینی بکەن من لەکۆتایدا دەلێم خاوەنی سیماو روالەتی مسولْمانانەبێ چونکە ئافرەتانی نائیسلامی زۆرجار وادەزانن کەئێمە دەلێین بائافرەتان ئەهلی دین و ئەهلی تاعەت بنو بۆلای خوا بگەرێنەوە، وا دەزانن بەس مەبەستمان ئەوەیە سەرپۆشێك بەسەردا بدەنو مانتۆیەك لەبەربکەن!! نەء بێگومان لەدوای هەموو شتێك سەرە دەگاتە سەر سەرپۆش و مانتۆو ئەو جلوبەرگانەی کەئافرەت خۆییان پێدادەپۆشێ، پێشێ دەبێ ئافرەت خاوەنی فەهمو تێگەیشتن بێ، لەدینەکەیدا شارەزابێ، پاشان دەبێ خاوەنی عیبادەتو ئیلتیزام بێو تاعەت بێ، ئینجا دەبێ خاوەنی رەوشتی بەرزبێ، خاوەنی ئەدەبی جوان بێ، خاوەنی تەزکیە بێ ئینجا دوایی دەبێ خاوەنی سیماو بەرگو پۆشاکی مسولْمانانە بێ، ئەگەرنا سیماو بەرگو پۆشاکی مسولْمانانە بەبێ شتەکانی دیکە دەبێتە

توێکڵی بێکاکڵ، دەبێتە دیکۆری بێ نیوەڕۆک و بەکەڵکی هیچ نایەت جا چ پیاو بێ چ ئافرەت، پیاوانیش پێش ئەوەی بیر لەپێشیان بکەنەوەو بیر لەپێش هێشتنەوە، وەبەرسمێڵ کردن و لەهەندێ شتی دیکەی لەوجۆرە بکەنەوە، دەبێ بیر لەوە بکەنەوە داخۆ چەند لەدین تێگەیشتوون ئیمانیان چەندەو عەقیدەیان چۆنەو عیبادەتیان چۆنەو ئەخلاقیان چۆنەو ئەدەبیان چۆنە؟! ئینجا دوایی نۆرە دەگاتە سەر سیماو ئەو شتانەی دیکە کە لەڕاستیدا زیاتر وەک دیکۆرو ڕواڵەت وان.

**ئەرکی دووەم: دووەمین ئەرکی ئافرەت لەبەرانبەر خێزانی دایە:**

چونکە ئافرەت چەند حاڵەتێکی هەیە:

یان ژنەو مێردی هەیە یان دایکەو منداڵی هەن، دیارە دەگونجێت مێردی هەبێت، یاخود مێردیشی نەما بێت، یان کچەو لەماڵی باوکی دایە، یاخود خوشکێکەو برای هەیە، ئافرەت ئەو چەند حاڵەتانەی هەن، جا ئافرەت لەهەموو حاڵەتەکاندا بەرانبەر بەخێزانی خۆی بەرپرسیارە، جارێ حاڵەتی ئاسایی ئەوەیە کەئافرەت ماڵ و مێردی هەیەو دیارە لەو حاڵەتەدا بەرانبەر بەماڵ و مێردی خۆی بەرپرسیارە، وەک پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (... **والمرأة راعية في بيت زوجها وهي مسؤولة عن رعيتها**) متفق عليه، واتە ئافرەت دوای ئەوەی بەرپرسیارێتی دینی بەرانبەر بەخۆی ئەنجام دەدات و، بۆ خۆی خاوەنی دین و ئیمان و تاعەت و تەقوا دەبێ، ئینجا بەرانبەر بەماڵ و مێردی بەرپرسیارە، وەهەر ئافرەتێک بەرانبەر بەخۆی بەرپرسیارێتییەکەی جێبەجێنەکات و ئەرکی خۆی بەرانبەر بەخۆی جێبەجێ نەکات، بەرانبەر بەماڵ و مێردیشی ئەرکی سەرشانی پێجێبەجێ ناکرێ، سەرەتا ئافرەت بەرانبەر بەمێردی بەرپرسیارە کەبەشێوەیەکی شەرعییانە ڕەفتاری لەگەڵدا بکات، جارێ هەر لەماڵ بنیات نانەوە ئافرەتی مسوڵمان دەبێ بەدوای مێردێکی مسوڵماندا بگەڕێ وەک چۆن پیاو بەدوای ژنێکی مسوڵماندا

دەگەڕێ، ئافرەتیش دەبێ چاو بۆ پیاوێکی بەدین بگێڕێ، یاخود هەرکات پیاوێکی خاوەن دین‌و ئەخلاق‌و مسوڵمان داخوازی کرد مادام بەدڵی بوو وەڵامی بداتەوەو زۆر تەماشای ژیان‌و گوزەران‌و پارەو سامان‌و کۆشک‌و تەلارو ئەوانە نەکات، دیارە ئەگەر کابرا مسوڵمان بێ‌و ئیمکانی‌یەتی‌و ژیان‌و گوزەرانیشی باشبێ بەهەرحاڵ باشە، بەڵام دەبێ ئەوەی کە ئەولەویەتی دەداتێ‌و لەپێشەوە حیسابی بۆ دەکات دین‌و ئەخلاق بێ هەروەها پیاویش بەهەمان شێوە، دیارە بەرپرسیارێتی ئافرەت بەرانبەر بەماڵ‌و مێردی دەگونجێ زۆری قسە لەسەر بکەین، کەئێستا ئەو دەرفەتەمان نیە، ئینجا ئافرەت بەرانبەر بەمنداڵەکانی بەرپرسیارەو بەرپرسیارێتی ئافرەت بەرانبەر بەمنداڵەکانی زۆر بەرپرسیارێتی‌یەکی گەورەیە چونکە ئەرکی سەرەکی ئافرەت‌و ئەرکی سروشتی ئافرەت زیاتر لەچوارچێوەی ماڵ‌و خێزانی دایە، دیارە ئافرەت لەدەرەوەی خێزانیشی بەرپرسیارە وەک باسمان کرد، بەڵام بەڕاستی ئەگەر ئافرەت ئەرکی خێزانی خۆی جێبەجێ نەکرد بەرانبەر بەماڵ‌و مێردی و بەرانبەر، بەمنداڵەکانی ئەوە بێگومان جم‌وجۆڵ‌و چالاکی دەرەوەی ماڵ‌و خێزانی هەرگیز ئەو کەلێنەی بۆ پڕناکاتەوەو بۆی تێ‌هەڵناهێنێتەوەو بۆی قەرەبوو ناکاتەوە، نە بۆ خۆی‌و نەبۆ کۆمەڵگاش، ئێوە سەرنج بدەن ئافرەتانی ئەوروپا کارگەو مەعمەلەکانیان پڕ کردوەو زۆر لەبوارو مەیدانەکانی کۆمەڵگایان پڕ کردوە، بەڵام چونکە ئەرکی سەرەکی‌و سرووشتی خۆیان فەرامۆش کردوە کۆمەڵگاکەیان بەرەو داڕووخان چووە...

### ئەرکی سێیەم: هەروەها ئافرەتی مسوڵمان لەبەرانبەر خزم‌و دەرو دراوسێ‌و دۆست‌و ئاشنای دا بەرپرسیارە:-

ئەویش بەوەی کەئەو ئیسلامەتی‌و مسوڵمانەتی‌و دینداریی‌یەی لەخۆیدا ڕەنگی پێداوە تەوە بیگەیەنێ بەوانیش‌و لەو خێرو بەرەکەتە بەهرەمەندیان

بکات، دیاره بەشێوازی جوان، هەروەها سەردانیان بکات و ڕێزیان بگرێ و دڵیان خۆش بکات، بێگومان ئینسان بەرانبەر بەدراوسێ زیاتر بەرپرسیارە تا خەڵکێکی دوورتر، وەبەرانبەر بەخزم زیاتر ئەرکی لەسەرشانە تا خەڵکێکی دوورتر، هەروەها کەسێك کە ڕەفیقیەتی و لەزانکۆ بەیەکەوەن یان لەقوتابخانە بەیەکەوەن یان لەشوێنێك بەیەکەوەن زیاتر بەرانبەری بەرپرسیارە تاکو یەکێکی دیکە چونکە ئەو پێی ئاشناترەو ڕەنگە قسەشی باشتر لێوەربگرێ.

## ئەرکی چوارەم: هەروەها ئافرەتی مسوڵمان، ئەگەر لەلایەنێکی ئیسلامیدا بێ بەرانبەر بەلایەنەکەی بەرپرسیارە:-

بۆ وێنە خوشکەکانی سەر بەکۆمەڵی ئیسلامی یان هەر لایەنێکی دیکەی ئیسلامی پێویستە بزانن کەبەرانبەر بەو کۆمەڵ و جەماعەتەو بەو لایەنە ئیسلامیە بەرپرسیارن، وەك چۆن برایەکان بەرپرسیارن، پێویستە دۆست و لایەنگر پەیدا بکەن و ڕووی گەشی ئەو کۆمەڵە پێشانی خەڵکی بدەن و دۆستی بۆ زیاد بکەن هاوکاریی بۆ کۆبکەنەوەو قەزییەکانی بەخەڵکی ڕابگەیەنن و دیفاعی لێبکەن، خوشکانیش بەهەمان شێوە بەرپرسیارن چ لەبواری بانگەوازو ڕێکخستن داو لەحاڵەتی ڕووبەڕووبوونەوەشدا، بەڵێ لەبواری بەرەنگاربوونەوەش دا، بەتەئکید خوشکانیش وەك برایان ئەرکیان لەسەرشانە، وەئەرکی سەرشانی ئافرەتان چ وەك زاتی خۆیان چ وەك پاڵپشتێکیش بۆ مێردەکانیان یان بۆ برایەکانیان یان بۆ کوڕەکانیان، چونکە جاری وا هەیە قسەی خێری دایکێك بۆ کوڕەکەی دەبێتە باشترین سەنەد، وەقسەی خێری ژنێك بۆ مێردەکەی دەبێتە باشترین پشتیوان، پیاوەکەی کەهاتەوەو هەرچەندە ژیان و گوزەرانیشیان باش نەبێ بەڵام ئەو ژنە بڵێ: پیاوەکە خەمت نەبێ تۆخەم لەدینی خوا بخۆ ئێمە خوای بەخشندە ڕزق دەرەو ئارام دەگرین و ئەهلی قەناعەتین، بێگومان ئەو پیاوە هەڵدەبڕێتەوەو،

مەعنەوییاتی بەرز دەبێتەوە، بەڵام ئەگەر پیاو هاتەماڵەوەو ئیدی بەحەق بێ یان بەناحەق، ژنەکەی گلەیی لێکردو پرتەو بۆڵەی بەسەردا کرد، ئەوە بەتەئکید ئەو پیاوە مەگەر زۆر خۆگربێ ئەگەرنا عەزیمەتی دەشکێ و بۆ دەرەوەش تواناو بڕستی کەم دەبێتەوە!!

## ئەرکی پێنجەم:- ئەرکی پێنجەم و کۆتایی ئافرەت بەرپرسیارێتی‌یەتی لەبەرانبەر کۆمەڵگاو میللەتی‌دا بەگشتی:

خوشکەکان! ئێمە هەموومان لەبەرانبەر ئەو کۆمەڵگاو میللەتەی خۆماندا بەرپرسیارین بەهەموو چین و توێژەکانی‌یەوەو بەهەموو تەیارو تەوژمەکانی‌یەوە، ئێمە نابێت تەنها بەرانبەر بەخەڵکی ئیسلامی هەست بەبەرپرسیارێتی بکەین و بڵێین، فلان کەس خوشکێکی ئیسلامی‌یە بۆیە بەرانبەری بەرپرسارین، بەڵام فلانە ئافرەتە خۆپابەند نی‌یە بەئیسلامەوە، یان بەرگ و پۆشاکی شەرعییانەی نیە بۆیە ئێمە بەرانبەری بەرپرسیارنین چونکە تازە ئەو سەری لێشێواوە سەرگەردان بووە!! نەخێر ئەوە ڕاست نیەو ئەو بۆچوونە هەڵەیەو ئەگەر پێغەمبەر ﷺ وە هاوەڵانی بەڕێزی بەپیاوو ئافرەتەوە بەوشێوەیە لەگەڵ کۆمەڵگای خۆیاندا ڕەفتاریان بکردایە، ئەوە ئێمە کۆمەڵگایەکی مسوڵمانانمان نەدەدی و دەست نەدەکەوت، چونکە ئەو کۆمەڵە پیاوانەو ئەو شێرە ژنانەی کەتێگەشتن و کۆمەڵگای مسوڵمانیان لێپێکهات هەر لەئەنجامی هەوڵی ئەو هاوەڵە کەمانەوە لەئافرەتان و لەپیاوان تێگەشتن و پێگەشتن، کە لەدەوری پێغەمبەر بوون ﷺ ئافرەتێك دەچوو تەئسیری لەدراوسێکانی دەکرد، یەکی دیکەش کاری لەخزمەکانی دەکرد پیاوێك دەچوو ڕەفیقەکانی بۆلای پێغەمبەری خوا دەهێناو، ئافرەت دەچوو دەستە خوشکەکانی خۆی دەهێنا!! بەڵێ هەمیشە ئێمە بەرانبەر بەو خەڵك و میللەتەی خۆمان بەرپرسیارین وەمن ئامۆژگاری دڵسۆزانەی خوشکەکانم دەکەم لەو بارەوە کەئێوە ڕەشبین مەبن بەرانبەر بەمیللەتەکەمان، چونکە ئەم خەڵك و

میللەتەی ئێمە تەئسیری کوفر کەتێی دەکرێ، تەئسیری جاهلیەت کەتێی دەکرێ، تەئسیری غەیرە دینی کەتێی دەکرێ، بەبۆچوونی من تەئسیرێکی زۆر (سطحي) و ڕووکەشیە، هی زۆربەی خەڵکەکە، دیارە خەڵکێك هەیە کەکاریگەرییەکە گەشتۆتە سەر ئێسقانی، بەڵام هی زۆربەی زۆری سەر پێستە، خۆتان چاکتر دەزانن گەلێك ئافرەتی وا هەیە زۆر لەسەر دڵی قورسە کەبەرگ و پۆشاکێکی ناشەرعی لەبەر دەکات و دەڵێ: حەزی لێناکەم، بەڵام ئەگەر وا نەکەم لۆمەم دەکەن و ڕەخنەم لێدەگرن، چونکە تازە مۆدیل وایەو دەستە خوشکەکانم پێم دەڵێن: دواکەوتووی، تازە چاولێکەرییە منیش دەبێ وەك ئەوان بکەم!! بەڵێ زۆریان هەن لەدڵەوە مورتاح نین بەبەڵگەی ئەوەی کەڕەمەزانان زۆر لەو ئافرەتانەی کەبەرگ و پۆشاکیان ناشەرعیانەیە تەماشا دەکەی بەحیسابی خۆیان وا دەزانن ئەگەر ڕەمەزانان بۆلای خوا بگەڕێنەوە ئەوەندە کافیە وەئەوەندە بەسە بۆیە تەنها ڕەمەزانان خۆیان دادەپۆشن، وە بیستوومانە زۆربەی هەرەزۆریان بەڕۆژوو دەبن و هەیانە غەیری ڕەمەزانیش هەرچەندە بەرگ و پۆشاکی تەواو نییە کەچی کەدەچێتەوە ماڵێ نوێژەکانی دەکات!! کەواتە بائێمە بێ هیواو نائومێد نەبین لەو خوشکانە کەبارودۆخێکیان بۆ نەڕەخساوەو هەل ومەرجێکیان بۆ نەسازاوە کە وەك ئێوە عەقیدەی ئیسلامی و ئادابی ئیسلامی و ڕەوشتی ئیسلامی وەربگرن، بائێمە دەستیان بگرین زەمینەیان بۆ خۆش بکەین و دڵیان خۆش بکەین وە بەتەئکیدیش کەسانێك هەردەمێنن کەبەدەنگ ئێمەشەوە نایەن، وەکەسانێکیش هەر هەن کەوەك گوتمان تەئسیری کوفر گەشتۆتە سەر ئێسقانیان و ئەوانەمان بۆ چاك نابێ، بەڵام با ئێمە ئەرکی خۆمانیان لەگەڵ جێبەجێ بکەین هەقی خۆیان کە لەسەرمانە بیان دەینێ، جائەوەی کەهات هات، ئەوەی کەخوا هیدایەتی دا باشە ئەوەش کەخوا هیدایەتی نەدا ئێمە لەبەرانبەریدا بەرپرسیار نابین، ئەنجا کۆتایی قسەکانیشم بەم چەند ئامۆژگارییە کورتە دێنم.

# (حەوت ئامۆژگاری پوخت)

**یەکەم:** ئامۆژگاری هەموو لایەکتان دەکەم بەوە کەبەر لەهەر شتێک لەقسەکردن و لەهەڵس وکەوتتان لەگەڵ دەوروبەرتاندا جەخت بکەن لەسەر ئەوەی کەخەڵک تێبگات کەئیسلام چی لێدەوێت، خوشکە بەڕێزکانم! زۆر کەس نازانێ دین چی لێدەوێ بەتایبەتیش کەبەداخەوە هەندێ کەس هەیە جا لە مەلا یان لەغەیری مەلا لەخەڵکی عەوام، کەدین وا نیشان دەدەن کەهەر شایەتمان بێنێ تازە تەواو، یانی فیکری ئیرجائی، فیکری مورجیئە بڵاودەکەنەوە، کەدەڵێ: هەر شایەتمان بێنە تازە تۆ مسوڵمانی و هاتوویتە نێو بازنەی ئیسلامەوەو هیچی دیکەی ناوێ، بەڵام دیارە ئەوە فیکری مورجیئەیە، حەیفێ هەندێک مەلا هەن ئامانجیان ژیان و گوزەران دابین کردنە بەهەر نرخێک بێ وەدەشزانن کەئەگەر بێت و دین و ئیسلامەتی بەجۆرێک بخەنە بەرچاو کەلەگەڵ هەواو ئارەزووی خەڵکی و سیاسەت و بەرژەوەندی سیاسەتمەداراندا بگونجێ، وە هەتا دین بۆ خەڵکی ئاسانتر بکەنەوەو تەنک تری بکەنەوەو ڕوونتری[9] بکەنەوە ئەهلی کوفرو ئەهلی جاهیلیەت زیاتر لێیان ڕازی دەبن ئەوانیش دەیانەوێ خەڵک لەخۆیان ڕازی بکەن، ئیدی سەرئەنجام دێنن هێندە دینداریی لەلای خەڵک گچکەو سەهل دەکەنەوە کەپێیان وایە تەنها بەشایەتمان هێنانێکی ڕووت دەبنە مسوڵمان و ئەگەر شەڕابیش بخۆنەوەو لەنێو حیزبێکی عەلمانیش دابن و نوێژیش نەکەن، دەڵێن تازە مادام شایەتمانیان هێناوە مسوڵمانی تەواو عەیارن و ئیمان و ئیسلامێکی تێرو تەواویان هەیە، وە زۆر جاریش وەک بەڵگە هێنانەوە بۆ سەلماندن و ئیسپاتی دەعوای مسوڵمانەتییەکەیان هەر ئەو فەتواو هەڵوێستە (مورجیئانە)ی ئەوجۆرە

---

[9] وشەی (ڕوونتر) لێرەدا مەبەست پێی پێچەوانەی (خەست)ە نەک پێچەوانەی لێڵ.

مەلایانە بەنموونە دێننەوەو دەڵێن ئەوە نییە ئەو مامۆستایانەش لەگەڵماندان و دەڵێن کاکە مسوڵمانەتی ئەوەیە بەس شایەتمان بێنی تازە تۆ مسوڵمانی!! بۆیە دەڵێم دەبێت ئەو خەڵکە تێبگەیەنرێ کەئیسلام چی لێدەوێ وەئیمان* یانی چی و ئیسلام یانی چی و ئینسان بەچی دەبێتە مسوڵمان؟! بەڵێ خوشکەکانم هەنگاوی یەکەمتان ئەوەبێ لەگەڵ خەڵك کە بەشێوازی جوان خەڵك حاڵی بکەن کەدین چی لەخەڵکی دەوێ؟ جاکاتێك تێڕوانینی خەڵك دەربارەی دین گۆڕا، هەڵوێستو کردەوەو تەسەڕوفیشی دەگۆڕێ، بەڵێ هەرکاتێ تێگەیشتنی خەڵك دەربارەی دین گۆڕاو زانی کەدین و مسوڵمانەتی تەنیا وشەیەك نییە بەدەم بگوترێ بەڵکو ئیمان هەم پەیوەندی بەنێو دڵ و دەروونەوە هەیەو هەم پەیوەندی بەعەقڵ و تێگەیشتنەوە هەیەو هەم پەیوەندی بەتەعبیری زمانەوە هەیە، وە هەم پەیوەندی بەکردەوەی ئەندامەکانیشەوە هەیە، وەبەهەر چوار بەشەکە ئەوجار ئیمان دروست دەبێ، ئەوجار مسوڵمانەتی دێتەدی، جائینسان هەرکاتێ ئەوەی لێحاڵی بوو وە یەقینی وابوو ئیسلام و ئیمان تەنها شایەتمان هێنان و قسەی زار نیە، ئەوە بێگومان ئەوکاتە تەنها بەشایەتمان هێنان واز لەمسوڵمانەتی ناهێنێ و لێی ناگەڕێ و ئەوکاتە بەتەئکید گۆڕانکاری بەسەر خۆیدا دێنێت.

**دووەم:** وە ئامۆژگاری دووەمم ئەوەیە، کەهەتا بۆتان دەکرێ بەڕەوشتی جوان و بەدڵسۆزیی و لەڕووی بەزەییەوەو بەپەرۆشەوە لەگەڵ خەڵکی قسە بکەن، نەك لەڕووی بوغزەوە، دیارە الحمدلله خوشکان عەتف و سۆزو دڵنەرمییان زۆرەو ئەو دیاردە هەڵەیە زیاتر لەنێو برایاندا هەیە کەبەداخەوە هەندێکیان زیاتر بەچاوی بوغزو غەرەزو قینەوە تەماشای خەڵکی دەکەن، کەبێگومان ئەوە هەڵەیەو دەبێ بەچاوی بەزەیی و سۆزو پەرۆشەوە بۆ خەڵکی بڕوانین و مامەڵەیان لەگەڵ بکەین، پێغەمبەران علیهم الصلاة والسلام هاتوون بەوپەڕی شێوازی بەرزو جوان و بەوپەڕی دڵسۆزیی و لەڕووی پەرۆشەوە کاری

بانگەوازیان ئەنجام داوەو دووعای خێریان بۆ میللەتەکانیان کردوەو چی چاکە ئەوەیان بۆ لەدڵ گرتوون ئەوجار لەگەڵیان ڕووبەڕووبوونەتەوە! وەکاتێکیش خەڵك قسەی نەفامانەشیان لەبەرانبەردا کردوون ئەوان ئەدەبی بەرزی خۆیانیان دیسان تێك نەداوە، تەماشا بکەن قەومی (عاد) بە (هود) دەڵێن چی، (هود) کەپێغەمبەرێکی پایە بەرزی خوایە ﷺ سەرنج بدەن گەلەکەی چەند بەبێ نەزاکەتی‌یەوە دەیدوێنن: (قَالَ الْمَلَأُ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ قَوْمِهِ إِنَّا لَنَرَاكَ فِي سَفَاهَةٍ وَإِنَّا لَنَظُنُّكَ مِنَ الْكَاذِبِينَ) (الأعراف:٦٦)

قەومی عاد قەومێکی سەرکەش‌و مل هوڕبوون، هود (علیه الصلاة والسلام) زۆر بەشێوازێکی بەرزو جوان دەچێ دەیاندوێنێ‌و دەڵێت وەرن بەندایەتی بۆ خوا بکەن، یەکتری مەچەوسێننەوە، خراپە مەکەن، ڕەوشتتان بەرز بێت، بت‌و صەنەم مەپەرستن! کەچی زلە زلانی قەومەکەی پێی دەڵێن: ئەی هود! بەتەئکید ئێمە تۆ لەبێ‌عەقڵی‌دا دەبینین وەپێشمان وایە تۆ پیاوێکی لەڕیزی دۆرزنانی!! واتە هەم بەبێ عەقڵ ناوزەدی دەکەن‌و هەم بەدرۆزن!! بەڵام چونکە هود (علیه الصلام والسلام) پێغەمبەرێکی پایەبەرزی خوایە نە منەو نە عەمرە و نە زەیدە، پێغەمبەرە ﷺ دەزانێ کەدەبێ بەرزو پارێزراو (معصوم) بێ لەهەڵەو دەزانێ کەخوا ناردوویەتی‌و ڕێزی گەورەی لێناوە، کەچی دەڵێ چی؟! ئایا دەڵێ: نەخێر بەڵکو ئێوە بێ عەقڵن ئەگەرنا من زۆر عاقڵم!! وە ئایا دەڵێ: نەخێر من زۆر ڕاستگۆم بەڵام ئێوە درۆزنن؟! کەبێگومان ئەگەر وایشی پێ‌فەرمووبایە زۆر ڕاست‌و دروست بوو؟! نەء بەڵکو بەم ئەدەبە بەرزو نەزاکەت‌و حورمەت‌و حیکمەتە جوانەوە دەیان دوێنێ (قال یاقومی) جارێ پێشێ هەستی نەتەوەیی‌و خزمایەتیان دەجووڵێنێ‌و دەڵێ ئەی قەومەکەم!! واتە خۆمن یەکێکم لەخۆتان‌و دڵسۆزم بۆتان، هەستیان دەجولێنێ وەك چۆن (موسی) علیه السلام – کەلەهاڕوونی باری تووڕە دەبێ‌و ڕیشی‌و قژی سەری بادەدات، هاڕوون علیه السلام پێی دەڵێ: (یا بن ام..) واتە ئەی کوری دایکم!!

خۆ دیارە کوڕی باوکیشی بووە، بەڵام دەیەوێ عەتفی کوڕو دایکایەتی لەدڵدا بجووڵێنێ! هودیش زۆر بەشێوازێکی جوان و زۆر عاتیفیانە دەڵێ ئەی گەلەکەم! (لَيْسَ بِي سَفَاهَةٌ وَلَكِنِّي رَسُولٌ مِنْ رَبِّ الْعَالَمِينَ)(الأعراف: من الآية٦٧) من بێ عەقڵ نیم بەڵکو ڕەوانەکراوم لەلایەن پەروەردگاری جیهانەوە، دوایی دەفەرموێ: (أُبَلِّغُكُمْ رِسَالاتِ رَبِّي وَأَنَا لَكُمْ نَاصِحٌ أَمِينٌ) (الأعراف:٦٨) پەیامەکانی پەروەردگارمتان پێڕادەگەیەنم وەمن دڵسۆزم بۆ ئێوەو ئەمینداریشم بۆتان، واتە تەنانەت وشەیەکیان پێناڵێ کەدڵیان گەرد بگرێ، جائەوە ئەدەبی بەرزی پێغەمبەرانە (علیهم الصلاة والسلام) وە ئەوەش شێوازی شەرعییانەی بانگەوازو ڕەفتارو مامەڵەیە لەگەڵ خەڵک دا.

سێیەم: ئامۆژگاری سێیەمم ئەوەیە کەبا فیزو کەشخە بەسەر خەڵکیدا نەکەین چونکە یەکەم: ئێمە ئەگەر خوا قبووڵ بکات، خوا پێداوین مادام لەسەر ڕێبازی پێغەمبەرین ﷺ وەبێگومان هەرکەسێك لەدونیادا لەسەر ڕێبازی پێغەمبەر بێ انشاءالله لەقیامەتدا لەخزمەتی پێغەمبەردا دەبێ، بەڵام باخۆمان لێ نەگۆڕێ و بافیز بەسەر خەڵکیدا نەکەین، چونکە جارێ خوا دەزانێ عاقیبەت و سەرئەنجاممان چۆن دەبێ دووەم: هەرکاتێ ئینسان خۆی بەباش زانی و پێی وابوو لەسەر ڕێگەیەکی ڕاستە، نابێ باشیەکەی خۆی بکاتە منەت بەسەر خەڵکەوە بەڵکو دەبێ بیکاتە منەت بەسەر خۆیەوەو بڵێ: خوایە زۆر مەمنونتم کەمنت هیدایەت داوە بۆ ڕێگای ڕاست و باش، وەدەبێ بەشێوەیەکی وا خەڵك بدوێنی بڵێ: خوشکم وەڵڵا هی من نازانم ڕەنگە تۆ لەلای خوا باشتربی! دەبێ ئاوا بیدوێنێ و بڵی تۆ بەچ مەعلوم ئەگەر بگەڕێیوە لای خوا زۆر لەپێش ئێمەدا ناچیت بۆ بەهەشت بەچ مەعلووم من ڕێم لێ تێك ناچێ! چونکە خەڵك هەمیشە ڕقیان لەکەسێکە خۆی بەباش بزانێ و خەڵك بەخراپ بزانێ و خەڵك هەمیشە ڕقیان لەئینسانی خۆبەزل گرو خۆپەسەندە، وە کەسێك کەخۆی پێباش بێ، زۆر هەڵەیە تۆ دەبێ خەڵك بڵێ باشی نەك خۆت پێباش

بێ، بەڕاستی ئەوە نوختەیەکی زۆر گرنگە بۆئەوەی کە (تأثیر) بکەین لەخەڵك وە بۆ ئەوەش شتێك نەڵێین پێچەوانەی شەرع بێت، چونکە خوای پەنهان بین دەفەرموێ (فلا تزكوا انفسكم) خۆتان پێچاك نەبێ (هُوَ أَعْلَمُ بِمَنِ اتَّقَى) (النجم: من الآية٣٢)) هەر خوا دەزانێ کەکێ تەقوای باشی هەیە!!

**چوارەم:** ئامۆژگاری چوارەمیشمان ئەوەیە کە لەڕاگەیاندنی دین و لە پەروەردەکردنی خەڵك و لەخەڵك فێری دینداریی‌کردندا باپلە پلەی (تدرج) ڕەچاو بکەین، بەڵام ئاگاداری یەك شت بین ئەویش ئەوەیە کەهەرچی دینی خوایە وەك خۆی بیخەینە بەرچاوی خەڵك، نەك بۆئەوەی خەڵك پێی ڕازی بێت بێنین حەڕامیان بۆ حەڵاڵ بکەن! نەء بەڵام دەتوانی ئەمڕۆ دوو حەڵاڵی پێ بڵێی و دوو ئەرکی پێ بڵێی، مەچۆ هەموو شتێکی پێ‌مەڵێ و لەسەری مەکە بەبارێکی قورس، بەڵام لەولاشەوە مەچۆ ئەگەر گوتی: باشە ئەرێ فلانە شت حەلاڵە؟! بڵێی بەڵێ حەڵاڵە، لەکاتێکدا کەقەدەغەشە هەر بۆئەوەی ڕازی بکەی!! نەء حەرام بۆ کەس حەڵاڵ مەکەن بۆئەوەی کەدینداریيان بۆ ئاسان بکەن، بەڵام دیسان مەشچن هەرچی حەڵاڵ و حەرام هەیەو هەرچی فەرزو سوننەت و قەدەغەو ناپەسەند (مکروە) هەیە، بەیەك لیست بۆیان ڕیزمەکەن تالێی ڕابکەن!! پێغەمبەریش دەفەرموێ ﷺ (يسروا ولاتعسروا)(متفق عليه) واتە ئاسان کەربن و زەحمەت خەر مەبن، واتە: دین بۆ خەڵك ئاسان بکەن بەڵام نەك بەو شێوەیەی کەحەڕامیان بۆ حەڵاڵ بکەن! بەڵکو بەوشێوەیە کەپلە پلەو وردە وردە، پێشی فەرزەکانیان پێ‌بڵێن، ئەوانیش لەگرنگترو گەورەترەوە بۆ شتی دیکە، دوای ئەوە بێنەسەر سوننەتەکان نەك بەیەك قائیمەو یەك لیست هەرچی فەرزو سوننەتە بۆی ڕیز بکەی. بەتەئکید ئەو نەفەرە دەڵێ وەڵڵاهـ هەرگیز ئەو بارە قورسەم بۆ دەست نادرێتێ و لەجیاتی نیزیك کەوتنەوە دووردەکەوێتەوە.

**پێنجەم:** ئەمجار ئامۆژگاری پێنجەمیشم ئەوەیە کە:- خوشکانی ئێمە دەبێ هەوڵ بدەن کەواقیع بگۆڕن نەك واقع بیان گۆڕێ، بەتایبەتی لەڕووی عادەت و نەریتەوەو لەڕووی خوو خدەی کۆمەڵایەتی یەوەو لەبواری بۆنەکانی ژن هێنان و شووکردن و تەعزیەو شین و شایی و ئەمانەدا، دەبێ خوشکان زۆر وریا بن چونکە پابەندیی ئینسان لەو حاڵانەداو شتانەدا دەردەکەوێ و لەهەڵوێست دا دەردەکەوێ، کەئایا تۆ تاچ رادەیەك پابەندی بەدینەوە؟!

بۆیە خوشکە بەڕێزەکانم ! وریابن و مەکەونە ژێر تەئسیری داب و نەریت و خووخدەی جاهیلییانەو با تەیارو تەوژمی جاهیلی ئێمە لەگەڵ خۆی رانەماڵێ! بەڵکو دەبێ لەبەرانبەریدا بوەستین، نەك هەر بۆئەوەی کەخەڵك رەخنەمان لێنەگرێ ئێمە تەسلیمی شتی ناشەرعی بین و وەك خەڵك بکەین!! ئینجا دیارە لەلایەکی دیکەوە دەبێ لەوەش وریا بین کەبەرگ و پۆشاکمان شەرعییانەبێ، هەندێ جاران سەرنج دەدەم چاوم لەهەندێك لەئافرەتان (هەڵ دەنگوێ) لەبازاڕدا هەست دەکەم خەریکە بەرگ و پۆشاکی شەرعییانە وردە وردە تەنازول بکات بۆ بەرگ و پۆشاکی ناشەرعیانەو وەك بڵێی سوڵحی لەگەڵدا بکات!! واتە بەرگ و پۆشاکی شەرعییانەی هەندێك لەخوشکان دەیەوێ سوڵح بکات لەگەڵ هی ناشەرعییانەدا بەو مەعنایەی کەهەندێ لەئافرەتان پۆشاکەکەیان بەشێوەیەك لێدەکەن و بەجۆرێکی لێدەکەن کە یان تەسکە یان بەشێوەیەکە زۆر لەبەرگ و پۆشاکی ناشەرعییەوە نزیکە، بەحساب ئەوە رەنگە جۆرە تەنازولێك و سوڵحێك بێت بۆئەوەی کەئەو ئافرەتە زەق نەیەتە بەرچاو!! جا من لێرەدا یەك ئامۆژگاریتان دەکەم ئەوە بۆ خوشکانیش و بۆ برایانیش خوای پەروەردگار دەفەرموێ: (ولن تَرْضَى عَنْكَ الْيَهُودُ وَلا النَّصَارَى حَتَّى تَتَّبِعَ مِلَّتَهُمْ )(البقرة: من الآية ۱۲۰) واتە بەتەئکید جوولەکەو نەصرانییەکان لێتان رازی نابن هەتا شوێن دینەکەیان نەکەون! ئەو خوشکە ئەگەر پێی وابێ ئەگەر بێت و لەجیاتی مانتۆو ئەو بەرگەی سەرتاپایە بەرگێکی دوو سێ نەوع

لەبەر بکات و بڵێ لێم ڕازی دەبن! بەخوا بەوەندە لێت ڕازی نابن هەنگاوی یەکەم، ڕەنگە بڵێن ئەوە باشە، بەڵام سبەینێ دیسان تێت هەڵدە پێچن و دەڵێن: بەخوا ئەوەش بەکەڵك نایەت، هەنگاوێکی دیکەش دەت هێننەوە دواوەو هەنگاوێکی دیکەش و هتد.. وەك خوا فەرموویەتی: (وَدُّوا لَوْ تُدْهِنُ فَيُدْهِنُونَ) (القلم:٩) تا دەتبەنە سەر ئەو شوێنەی کەبۆ خۆیان دەیانەوێ، جا لەعەقیدەدا هەروایەو لەبواری سیاسەتدا هەر وایەو لەبواری بەرگ و پۆشاکدا هەروایەو لەبواری عادات و نەریتیش دا هەروایە، کەواتە باهەر لەئەوەڵەوە تەنازول نەکەین، دیارە ئەوانەی کە وردە وردە خوا هیدایەتیان دەدات قەیناکات بەپلە پلەیی بیانهێنین، بەڵام باخوشکەکانمان بەرگ و پۆشاك و ئادابی شەرعییانە لەخۆیاندا کاڵ نەکەنەوەو سوڵحی پێنەکەن لەگەڵ بەرگ و پۆشاك و عادات و نەریتی ناشەرعییانەداو لەنێو قەدی ڕێگادا بیانگەیەننە یەك و سەرئەنجام وابێ هیچ لایەکیان نەبێ بەتەواوی و شتێکی نامۆو سەیر بێت!!

<u>شەشەم</u>: ئامۆژگاری شەشەمیشم ئەوەیە کە بۆ ئەوەی هەم خۆتان چاکەو بەهرەو خێرو بەرەکەتەکانی شەریعەتی خوا بۆ ئافرەتان و خێزان بزانن و هەم زیاتریش بەرچاوی ئەو خەڵکە ڕۆشن بکەنەوە کەبانگیان دەکەن بۆ ئیسلام، هەمیشە هەوڵ بدەن وێڕای خستنەڕووی حیکمەتەکانی شەریعەتی بێ هەڵەو پەڵەی خوای کاربەجێ جەخت و تەرکیزیش بخەنە سەر واقیعی ئافرەتان لەکۆمەڵگاکانی ڕۆژئاواداو بزانن بەچ مەرەدێك چوون!! هەندێك سەرژمێر (إحصاء) لەوبارەوە هەن هەڵبەتە ئەگەر ناچاری نەبووایە باسم نەدەکردن، بەڵام شوێن و مەقامەکە دەیخوازێ، بۆ وێنە: لەهەندێك وڵاتانی ڕۆژئاوادا (٧٥٪) منداڵەکانیان (زۆڵن)[١٠]! لە ٧٥٪ی منداڵان واتە ٣/٤ی کۆمەڵگای ئەو وڵاتە چ پیاو چ ئافرەت زۆڵن باوك و دایکی شەرعییان نییە! ئنجا ئەو نەخۆشییانەی کەلەئەنجامی داوێن پیسی و فەسادو بەرەڵایی یەوە بڵاودەبنەوە

---

[١٠] لەبەریتانیا وایە، بڕوانە: (عالمية الاسلام ومادية العولمة) سميح عاطف الزين، ص ١٢٥.

زانایان دەڵێن هەتا ساڵی (٢٠١٥) یان (٢٠٢٠) ئەگەر بەوشێوەیەو ڕێژەیەی کەئێستا هاتوە نەخۆشی‌یە جنسیەکانی بەتایبەتی نەخۆشی (ئیدن) بەردەوام بن و ئەگەر بەوشێوەیە بڕۆن دەڵێن ساڵانە زیاتر لەوانەی کەلەجەنگی جیهانی دووەمدا کوژراون. کەپەنجا ملیۆن کەس لەجەنگی جیهانی دووەم لەبەین چوون. دەڵێن وای لێ دێ کەساڵانە بەو نەخۆشیانە زیاتر لە کوژراوانی جەنگی جیهانی دووەم لەبەین دەچن! وەئێستا کە ئافرەتی ڕۆژئاوا لەنێویاندا تەیارو تەوژمێك پەیدا بووە داوا دەکەن لەحکومەت و لەپیاوان وەدەڵێن بمانگێڕنەوە بۆ ماڵەکانی خۆمان، دەڵێن: ئێوە واتان لەئێمە کرد بەیەکسانی یەکسانی کەسەرئەنجام نەبووینە پیاوو لەئافرەتیش شۆڕاوین!! ئەو برایانەمان کەلەو وڵاتانەن دەڵێن ئافرەتان دەبینین چی دەکەن کەنناسی دەکەن حەمباڵی دەکەن لەگەراج و لەفڕۆکەخانەکان ئافرەت خوا خوایەتی یەکێك بڵێ وەرە دادە ئەم جانتایەم بۆ هەڵگرە، وەرە ئەم کەل‌وپەل و ئەم جانتایەم بۆ بخەرە سەر ئەو عەرەبانەیە! بەڵێ ژمارەیەکی زۆریان لەو ئافرەتە کلۆڵانە کە بەناوی ئازادی‌و یەکسانی‌یەوە فریو دراون و چەواشەکراون کەنناسی دەکەن، حەمباڵی دەکەن، کرێکاری دەکەن، پیشەی سووک سووك ئەنجام دەدەن، برایەکی خۆمان بۆی گێڕامەوە گوتی: لەئافرەتێکم پرسی لەوجۆرە ئافرەتانە کەئایا هەست بەبەختەوەریی دەکەی؟! ئەویش لەوەڵامدا گوتی: نەخێر هەست بەهیچ بەختەوەرییەك ناکەم، جائەگەر ئەم حاڵە بەختەوەریی بێ دەبێ بەدبەختی چۆن بێ؟، گوتی پێم گوت: باشە حەزناکەی کەئێستا ماڵ و حاڵێکت هەبووایەو منداڵت هەبووایە؟! گوتی دیارە ئافرەتەکەش تەمەنێکی هەبوو، لەوەڵام دا گوتی: با، زۆریش حەز دەکەم بەس من هەتا گەنج بووم بەنەوعێکی دیکە ژیام و ئێستاش بەهەرحاڵ تازە چوومەتە تەمەنەوەو زۆریشم پێ‌خۆشە منداڵم ببوایەو هەر یەك دوو منداڵم ببوایە، بەڵام تازە ئەو ئومێدەشم نەماوە!! جا خوشکەکانم ئێوە باسی واقیعی گەندەڵی ئافرەتانی کلۆڵی (ڕۆژئاوا) بکەن، جا ئەو کاتە هەرکەسێك هەر تۆزێك ویژدانی هەبێ و بشزانێ ئافرەت لەوێ

وەزعی چۆنە ئەوکاتە بەتەئکید قەدری نیعمە تی دینی خوا دەزانێ، ئەوکاتە دەزانێ کەئافرەتی مسوڵمان‌و ئافرەت‌و خێزان لەسایەی شەریعەتدا چ بەهرەیەکی دەست دەکەوێ‌و چ نازو نیعمەتێکی چنگ دەکەوێ‌و لەچ کەرامەت‌و ڕێزو حورمەت‌و خۆشبەختییەکدا دەژیەت!

**حەوتەم:** ئامۆژگاری حەوتەمیشم بۆ خوشکانیش‌و برایان‌و بۆ هەموو لایەك ئەوەیە کە: با زەمینە خۆش بکەین بۆ خوشکانمان‌و با لەسنووری شەریعەتدا مافەکانیان بۆ دابین بکەین، وە بائافرەتانیش داوای مافەکانی خۆیان بکەن بۆئەوەی بتوانن ئەرکە شەرعییەکانیان جێبەجێ بکەن، چونکە بەتەئکید بەبێ پیاوو ئافرەت‌و بەبێ دەستبار بۆ یەکتر گرتنی هەردووکیان ئەم کۆمەڵگایەی کوردەواریمان ناتوانێت گۆڕانکاری‌و وەرچەرخانێك لەخۆیدا دروست بکات بەرەو دین، بەرەو شەریعەتی‌خودا بەرەو مسوڵمانەتییەك کەشەریعەت فەرمانی پێکردوە، هەربۆیەش هەموو ئایەتەکان‌و فەرمایشتەکانی پێغەمبەر ﷺ هەمیشە فەرمان دەکەن بەپیاوان‌و بەئافرەتان کەبەیەکەوە دەستبار بۆ یەکتر بگرن وەبەهەموویان مشووری دین بخۆن، جادیارە هەم خوشکان دەبێ خۆیان جەخت بکەن لەسەر مافەکانی خۆیان‌و لەسەر ئەوەی کەشەرع ڕێی پێی داون، وەهەم پیاوانیش بەحەقیقەت دەبێ پیاوانیش بزانن کەئەو ئافرەتانە مافیان هەیە، هەقیان هەیە، وەئێمە ئەگەر هەق‌و ماف بۆ ئافرەتەکانمان دابین نەکەین، چ خێزانمان بن چ کچانمان بن خوشکانمان بن چ دایکانمان بن، ئەوە گوناهبارمان دەبین‌و بۆ دونیاو بۆ قیامەت قەرزداریان دەبین وەبەتەئکید کۆمەڵگەی کوردەواریش ناتوانێ بچێتە ئەو ئاستەوە کەشەریعەت لێی داوا کردوە بەبێ هاوکاری پیاوان‌و ئافرەتان، خوای کاربەجێش فەرموویەتی: (وَتَعَاوَنُوا عَلَى الْبِرِّ وَالتَّقْوَى)(المائدة: من الآية٢).

وصلى الله على محمد واله وصحبه أجمعين
والحمدلله رب العالمين

## نێــــوەرۆك

